- ناوی کتێب: ڕێویەکی سەیر
- وەرگێڕانی لەفارسیەوە: حەمە رشید
- بابەت: چیرۆک بۆ منداڵان
- تایپ: کاوان جمال
- تیراژ: ٣٥٠
- ژمارەی سپاردن: ٢٠٧
- چاپخانە: ژیار
- جێبەجێکردنی بەرگ: هونەرمەند قادر میرخان
- هەندی لە مۆنتیڤەکان: هونەرمەند شیلان جبار

SAR

زنجیرە کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (٢٣)

# پێشکەشە

**بە هەموو ( ئارا ، رەوا ، ئاژان ، یاد و ئەوین ) ە کانی**

**کوردستان**

## سوپاسنامە

بۆ ئەوەی ئەم چیرۆکە بە کاڵی و کرچی نەکەوێتە بەر دیدی منداڵانی کوردستان پێویستە ئەو کەسانەی کە شوێن پەنجەیان بەسەر ئەم چیرۆکەوە دیارە لە یاد نەکرێن .

- ئەم چیرۆکە ئەگەر سەرنج و تێبینیەکانی برای بەڕێزو خۆشەویستم کاك ئاسۆس هەردی لێ دەربهێنرێت پێموایە هیچی لێنامێنێتەوە بۆیە خۆم و چیرۆکەکەش قەرزاری کاك ( ئاسۆس ) ین .
- هەڵسەنگاندنە بە برشتەکانی هاوڕێی و هاوسەنگەرم شەهیدی جوانەمەرگ ( یوسف شریف ) کە تاکو ئێستاش لە گوێمدا دەزرنگێتەوە ، لەو باوەڕەم کە کاریگەری نەك بەسەر ئەم چیرۆکەوە هەیە بەڵکو کاریگەری لەسەر بیرکردنەوە و ڕەوتی ژیانیشمەوە هەیە .
- سوپاسی بەڕێز کاك ئاکۆ کریم دەکەم بۆ سەرنجەکانی لەسەر ناو، و ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکە .
- سوپاسی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەکەم کە هەمو ئەرکێکی ئەم بابەتەی گرتە ئەستۆی خۆی

# ڕێوی‌یەکی سەیر[1]

ڕۆڵد داڵ لە ساڵی ١٩١٦ ی زاینی لە باوەشی خێزانێکی نەرویجی نەژاد لە بریتانیا لە دایك بوە و خویندنشی هەر لە بەریتانیا تەواو کردوە.لە گەلێك وڵاتانی دونیای وەکو نایروبی، لیبیا، یونان، سوریا، ئەمریکا و ...ژیانی بەسەر بردوەو سەرەتای نوسینیشی بە چیرۆك بۆ گۆڤارەکان دەست پێکردووە. ڕۆڵد داڵ ژمارەیەکی زۆری چیرۆك و داستانی‌بۆ منالان، و هەرزەکان بە چاپ گەیاندوە کە گرنگترینیان بریتی‌یە لە
(ڕێوی‌یەکی‌سەیر، پەنجەی ئەفسوناوی، چارلی‌و کارگەی نوقل، چارلی و ئاسانسۆرە مەزنە شوشەییەکە ١، سەرزەنشت، جیمزو دێوی قۆخ و ... )

---

[1] ڕێوی‌یەکی سەیر لە کیهانی بچەها، سالی سی و چهار ، دورەء جدید شمارەء ( ٤٤٩، ٤٩٥، ٤٩٦، ٤٩٧، ٤٩٨، ٤٩٩، ٥٠٠ ) حبیب الله لزگی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی .

## ١- سێ خاوەن کێڵگە

دۆڵێکی پان و بەرین، سێ کێڵگەی جوانی لەباوەش گرتبو، هەر چەند خاوەن کێڵگەکان زەوی و مەزراکانی خۆیان ئاوەدان کردبووە بەڵام خۆیان خەڵکانێکی

خاوێن و ڕێکو پێك نەبون، لە ڕاستیدا هێندە پیس و پۆخڵەوات بون کەس چاوی پێیان هەڵنەدەهات. ئەو سێکەسە ناویان ((مامران، قازیان، سێوان))بو مامران، مریشکی بەخێو دەکرد و خاوەنی هەزاران مریشك بو، سێژەمە، سێ مریشکی سورەوەکراوی دەخوارد بۆیە زۆر خرپن و قەڵەو بو.

قازیان، قازو مراوی بەخێو دەکرد و بە هەزاران قازو مراوی هەبو، کورتە بنەیەکی قەڵەو بو، چەناگەیشی ئەوەندە بچوك بو لەوە دەچو یەکێك چەناگەی قرتاندبێ و لەگەڵ خۆیدا بردبێتی، خواردنی قازیان بریتیبو لە دڵ و جگەری

قازو مراوی. قازیان، دڵو جگەرەکانی سوردەکردەوە وبە نانەوە دەیخوارد. ئەم خواردنە سەیرە قازیانی دوچاری نەخۆشی دڵ کردبو هەروەها گیانێکی ئاژەڵانەیشی پێبەخشیبوو.

سێوانیش قەل و باخی سێوی هەبو، خاوەنی هەزاران قەل و داری سێو بو. سێوان هەرگیز وەکو کەسێکی ئاسایی نانی نەدەخوارد بۆیە چەشنی قەڵەم درێژو باریك و

ڕەنگی مردویشی لێنیشتبو. هەمیشە لە جیاتی خواردن شەربەتی سێوی دەخواردەوە و شەربەتەکەیشی هەر لە باخەکەی خۆی دروست دەکرد. سێوان لە مامران و قازایان زرنگترو وریاتر بو.

مامران، قازیان و سێوان

قەڵەو، کورت و درێژ

چەندە ترسناك و سەیرن !

ئەمە گۆرانی‌یەك بو کاتێك مناڵان ئەو سێ کەسەیان دەبینی بەدەم پێکەنینەوە دەیانوتەوە.

## ٢- ڕێوی

گردەکەی سەروی دۆڵەکە دارستانێکی بچوکی لێبو، لە نێو دارستانەکەدا پیرە دارێك هەبو، لە ژێر ئەو پیرە دارەدا کونێکی بچوك دەبینرا و لەناو کونەکەدا جوتێك ڕێوی نێرو مێ لەگەڵ چوار بێچوی زیتەڵەی زرنگ دەژیان.

ڕۆژانە کە دونیا بەرەو تاریکی دەڕۆیشت، مام ڕێوی روی دەمی دەکردە خێزانەکەی ولێی دەپرسی! (( هاوسەرە خۆشەویستەکەم، بۆ شێوی ئەمشەومان پێویستیت بە چیە؟ مریشکێکی قەڵەو لە مریشکەکانی مامران؟ مراوی یا

قازێك لە کێڵگەکەی قازیان.؟ یا قەلێك لە قەلەکانی سێوان؟))
کاتێك خاتو ڕێوی وەڵامی دەدایەوە کەچی دەوێت، مام ڕێوی لە دۆڵەکەوە سەرەو خوار دەبوەوە، لە ژێر پەردەی تاریکی شەودا دەستوبرد هەڵیدەکوتایە سەر ئەو کێڵگەیەی کە دەست نیشانی کردبو ئینجا بە دەستی پڕەوە بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە.
مامران، قازیان و سێوان باش دەیانزانی کەچ شتێ دەبێ ڕوبدات.
ئەوانە بەم کارە زۆر تورەو نارەحەت و سەر شێت دەبون و لەو کەسانەش نەبو حەز بکەن بەم ئاسانییە مریشك و قازو مراوی و قەلەکانیان لە دەست بدەن بۆیە شەوانە هەرە یەکەو بە تفەنگێکەوە خۆیان لە سوچێکی کێڵگەکانیان حەشار دەداو چاوەڕوان دەبون تا سەر و کەللەی مام ڕێوی دەربکەوێت و بە گوللەیەکی گەرم دڵی سارد بکەنەوە.
بەڵام مام ڕێوی لەوان وریاتربو لەبەر ئەوە بە پێچەوانەی ڕەوتی ( با ) وە هاتوچۆی دەرکرد تا بۆنە جیاوازەکان لە یەکتری جیا بکاتەوە. ئەم کارەیشی بۆ ئەوە دەکرد تا ئەگەر کەسێك لەسەر ڕێگەکەی بۆسەی بۆ نابێتەوە بە بۆن هەستی پێبکات وریگەکەی خۆی بگۆڕێت. بۆ نموونە ئەگەر مامران لە پشتی ریزە کولانەی ژمارە یەك ( ١ ) خۆی مەڵاسدایە مام ڕێوی لە دوری پەنجا(٥٠) مەترەوە هەستی بە بۆنەکەی دەکردو بەرەو ریزە کولانەی ژمارە پەنجاو چوار ( ٥٤ ) دەرۆیشت کەلەوپەری کێڵگەدا بو. مامران دەیوت: (( ئەو حەیوانە نەفرەتیە لە ( با ) دەچێت ! ))
قازیان هاواری دەکرد : (( دەمەوێت ئەم ڕەشەبا ناوەختە لە توپەت بکەم. ))
سێوان بە دڵنیاییەوە دەیوت: (( پێویستە بکوژرێت . ))
مامران دەیپرسی : (( بەڵام چۆن؟ بەچ جۆرێك دەتوانین لەسەر روی زەوی ( با ) دەستگیر بکەین؟ ))
سێوان لەو کاتەی پەنجەی لە کونە لوتی ئاخنی بو لە ناکاو بیرۆکەیەك بە مێشکیدا هات، وتی :
(( نەخشەیەکم هەیە ))

قازیان بە پێکەنینەوە وتی: (( تۆ، کەی توانیوتە نەخشەیەکی ڕاست و گونجاو گەڵاڵە بکەین. ))
سێوان وتی: (( گوێ ڕادێرن ! سبەی شەو هەموو پێکەو بەرەو کونە ڕێوییەکە دەڕۆین. کاتێك لە کونەکەی دێتە دەرەوە ، ئێمەش لەوێ دەبین و ئنجا ، تەق... تەق... تەق... ))
قازیان وتی: (( بەڵێ، نەخشەیەکی باشە، بەڵام پێویستە لە پێشدا کونە ڕێوییەکە بدۆزینەوە چونکە ئێمە تا ئێستا نازانین کونەکە لە کوێیە؟ ))
سێوان بە دەم پێکەنینێکی گاڵتە جاڕییەوە وتی : (( من دەزانم کونەکەی لە کوێیە. دەزانن لە کوێیە؟ لە کونی ژێر پیرەدارەکەی ناو دارستانی سەر گردەکەیە؟ ))

## ٣- دەسرێژ:

مام ڕێوی ووتی: (( ژنە خۆشەویستەکەم، شێوی ئەمشەومان چی بێت؟ ))
ژنەکە وتی: (( مراوی ! بەڵێ، پێم وایە مراوی باشترە ))
مام ڕێوی وتی: (( کەواتە ئەمشەو دو مراوی قەڵەومان دەوێت، یەکێکی بۆ هەردوکمان، ئەویتریان بۆ منداڵەکان. بەڵێ بیرێکی سەرنج ڕاکێشە! ))
ژنەکەی وتی : (( باشترین

مراوی قازیان! بەڵام دەبێت زۆر وریا بیت. ))
مام ڕێوی وتی : (( خەمی منت نەبێ، لە دوری دو کیلۆمەترەوەهەست بە بۆنی ئەو خەڵکە بودەڵانە دەکەم. تەنانەت دەتوانم بە بۆن لە یەکتریان جیا بکەمەوە. مامران بۆنی پێستی مریشکی گەنیوی لێدێت، قازیان بۆنی دڵ و جگەری قازی رزیو دەدات، سێوانیش بۆنی شەربەتی سێوی بۆگەن، هەر دەڵێی گازی ژەهراویە! ))
ژنەکەی وتی : (( راستە! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەبێ ئاگات لە خۆت بێ چونکە خۆت دەزانی ئەو سێکەسە دەیانەوێ بتکوژن! ))
مام ڕێوی وتی : (( خەمی منت نەبێ، وا ڕۆیشتم، خوا خافیز ! ))
هەرچەندە مام ڕێوی زۆر لەوە ئازاتر بو کە خۆی بدا بە دەستەوە، بەڵام لە راستیدا نەیدەزانی ئەوسێ کەسە لە کوێ خۆیان بۆ ناوەتەوە، بەڵام. ئێستا رێك لە دەرەوەی کونەکە بون و تفەنگەکانیان لەسەر پێبو، هەروەها لە شوێنێکدا خۆیان حەشاردابو کە ( با ) بۆنیان بە لوتی مام ڕێوی نەگەیەنێ.
مام ڕێوی لە کونەکە سەرکەوتە سەرەوە بەڵام لەدەمی کونەکەدا وەستا. ئەو لەکاتێکدا تەنها سەری لە کونەکە هێنابوە دەرێ، خۆی دا بەسەر هەردوو دەستیداو تەماشای تاریکی دەرەوەی کونەکەی کردو بۆنێکی کرد، ئنجا کەمێکی تر سەرکەوت و بۆنێکی تری کرد، مام ڕێوی بەردەوام چاوی بە هەمو لایەکدا دەگێڕا تا نەکەوێتە تەڵەوە، کەمێکیتر سەرکەوت، ئێستا نیوەی لەشی لە دەرەوەی کونەکەیە و بە جوانی دەبینرێ، لمۆزە رەش و هەستیارەکەی بە هەمو لایەکدا دەگێڕاو خێرا خێرا بۆنی دەکرد تا هیچ مەترسییەك لە ئارادا نەمێنێت.
مام ڕێوی هەستی بە هیچ بۆنێك نەکرد لەبەرئەوە بڕیاری دا لە کونەکە دەرچێتە دەرەوە. لەناکاو گوێی لە خشپەیەك بۆ یا واهەستی کرد گوێی لە خشپەیەك بوە. دەنگێك لە خشەی گەڵا دەچو. وەکو ئەوەی یەکێك پێ بەسەر گەڵای وشکدا بنێت.

مام ڕێوی بە بیستنی ئەم دەنگە بە تەواوی لەسەر کونەکە مت بو، بێجوڵەو بێدەنگ مایەوە وگوێی هەڵخست. مام ڕێوی ماوەیەکی باش بەو جۆرە مایەوە بەڵام ئیتر دەنگەکە نەبیسترایەوە. مام ڕێوی لەبەر خۆیەوە وتی: (( دەبێ مشکە کوێرە یا گیانەوەرێکی بچوکی تر بوبێت. ))
مام ڕێوی کەمێکی تر لە کونەکە هاتە دەرەوە. بەڵام هێشتا بەشێکی لەشی هەر لەناو کونەکەدا بو، ئنجا بە وریایی چاوی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا جگە لە پیرە دارێك کە تریفەی مانگە شەو لە نێوان لق و پۆپەکانییەوە دەدرەوشایەوە هیچی تری بەدی نەکرد. ڕێك لە هەمان شوێن دا، مام ڕێوی لە پشتی دارەکەوە بریسکەی شتێکی بینی کە زۆری لێوە نزیك بو تیشکی زیوین! ڕوناکی مانگ! پارچەیەك لە مانگ !.
مام ڕێوی هێشتا هەر لەسەر کونەکە بو، تەماشای شوێنی بریسکەکەی دەکرد و بیری دەکردەوە : (( لەدەرەوەی کونەکە چ دەکات. کەوتە جوڵە. سەرکەوت... خوای گەورە، ئەمەلولەی تفەنگێکە ! ))
مام ڕێوی لەچاو تروکانێکدا خۆی هەڵدایە ناوکونەکەوە. لە هەمان کاتیشدا وایدەهاتە بەرچاو کە شتەکانی چوار دەوری سەرقەدی دارەکە دەتەقنەوە:
تەق... تەق... تەق...
هێشتا دوکەڵی تفەنگەکان هەر بە ئاسمانەوە بو، مامران و قازیان و سێوان لە پشتیدارەکەوە دەرپەڕین و پەلاماری کونەکەیان دا.
سێوان پرسی: (( ئایا پێکامان ؟ ))
مامران لایتێکی لە کونەکەدا، لە بازنەی ڕوناکی لایتەکەدا، نیوەی ڕوناکییەکە لەناو کونەکەو نیوەکەی تری لە دەرەوەی کونەکە بو، چەند دڵۆپە خوێنێك و دوا بە دوای ئەویش کلکە ڕێوییەك دەبینرا...
سێوان دانەوییەوە و کلکە ڕێوییەکەی هەڵگرت و بە تورەییەوە وتی: (( بەر کلکی کەوتوە، ئەو ڕێوییە بەدفرە ڕایکرد.))
سێوان دوای ئەم قسەیە، بە قینەوە کلکە ڕێوییەکەی بەرەو تاریکیەکە تورهەڵدا.

مامران وتی: (( ئەو حەیوانە نەفرەتیە لە ( با ) دەچێت! زۆر درەنگ دەستمان لێکردەوە.دەبوایە وەکو باڵندە هەڵمەتمان بردایە و هەر بە ئاسمانەوە لێمان دایە. )).
سێوان ووتی : (( ئەو ڕێوی‌یە نەفرەتییە نەیدەویست بە خێرایی لە کونەکەی بێتە دەرەوە تا بتوانین بە ئاسمانەوە لێ‌ی بدەین
سێوان دوای ئەم قەیە شوشەیەك شەربەتی سێوی لە جنتاکەی دەرهێنا، ئنجا وتی :
((ئەو تا سێ ڕۆژی تر دەتوانێ لە کونەکەیدا بەرگەی برسێتی و تینوێتی بگرێ ئیتر دوای ئەوە ناچار دەبێ بێتە دەرەوە. ))
قازیان وتی : (( من ناتوانم سێ ڕۆژ چاوەڕوانی ئەو بکەم. وەرن با چواردەوری کونەکەی هەڵکۆڵین و بیهێنینە دەرەوە .))
مامران وتی: (( کەمێك ئارام بگرن! بۆ بەپەلە بیر بکەینەو. لە راستی‌دا دەتوانین لەدو سەعات دا کونەکەی هەڵکۆڵین و لە دەرەوەی کونەکەیدا بیکوژین. ئێستا بەلایەنی کەمەوە دەزانین کونەکە لە کوێ‌یە. ))
قازیان وتی: (( پێم وایە ئەو کونە چەندین ڕێوی تری تیا بێ. ))
سێوان وتی:((زۆر چاکە، کەواتە ژمارەیەکی زۆرتری ڕێویمان دەبێ. خێرا دەست بدەنە خاکەنازەکانتان.))

## ٤- بێڵە ترسناکەکان

لەناو کونەکەدا، ژنەکەی بە کاوە خۆ جێ‌ی کلکە قرتاوەکەی مام ڕێوی دەلستەوە تاکو خوێنەکەی بگیرسێتەوە.
مام ڕێوی وتی : (( ئازاری زۆرە))
ژنەکەی وتی : (( بەڵێ، دەزانم، بەلام بەم نزیکانە برینەکەت سارێژ

دەبێتەوە. ))

یەکێك لە بێچوە ڕێوی‌یەکان وتی : (( باوکە، خەفەت مەخۆ، زۆر ناخایەنێ لە جێگەی کلکە قرتاوەکە کلکی ترت بۆ دەردێتەوە.

مام ڕێوی بەبێ تاقەتی تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کردو ، وتی :

(( کلکم هەرگیز دەرنایەتەوە، دەبێ تا مردن بێ کلك بژیم ... ))

ئەو شەوە مام ڕێوی و خێزانەکەی هیچ خواردنێکیان نەبو، بێچوەکانی زو خەویان لێکەوت، ژنەکەیشی دوای کەمێك خەوە کوتکێ ئەویش نوست. بەڵام مام ڕێوی خەوی لێنەکەوت چونکە برینەکەی ئازاری دەدا. مام ڕێوی کەوتە بیر کردنەوە: (( زۆر باشە، من زۆربەختەوەرم کە توانیم بە سەلامەتی لە ژێر دەستیان ڕزگارم بێ. ئێستا ئەوانە شارەزای کونەکەن. دەبێ بە زوترین کات ئێرە بەجێ‌بهێڵین. ئیتر ئێمە هەرگیز هێمنی بە خۆمانەوە نابینین. ئاه، چی‌بو؟!))

مام ڕێوی سەری بەرز کردەوە و گوێی هەڵخست، ئەو دەنگەی مام ڕێوی بیستی، ترسناکترین دەنگ بو بۆ هەر ڕێوی‌یەك لە لانەکەیدا کە گوێی لێبێت، دەنگی بێڵ بو کە ورگی زەوی هەڵدەدڕی و خاك و خۆڵی سەر کونەکەی لادەدا... مام ڕێوی هاواری کرد: (( هەڵسن! خێراکەن ! ئەوانە دەیانەوێ لانەکەمان هەڵدڕن و خۆشمان لە دەرەوە بکوژن. ))

ژنەکەی ئاگاداری ئەم ڕووداوە نەبو، هەر لە خەو هەستاو بە دانیشتنەوە بە هێمنی پرسی: (( دڵنیای ؟ ))

مام ڕێوی ووتی: (( بەڵێ، دڵنیام، گوێ رادێرە! ))

ژنەکەی بەدەم ناڵە گریانەوە قسەکانی بەمام ڕێوی بڕی‌و، ووتی : (( دەیانەوێ مناڵەکانم بکوژن. ))

مام ڕێوی وتی : (( هەرگیز ! ))

ژنەکەی هەر بەدەم گریانەوە وتی : (( ئازیزەکانم، دەیانەوێ بێنە ژورەوە. ))

دەنگی هەڵکەندنی کونەکە دەگەیشتە گوێ‌و هێدی هێدی وردە بەردو کەستەکیش دەکەوتنە خوارەوە. یەکێك لە بێچوە ڕێوی‌یەکان پرسی: (( دایکە ! بەچ شێوەیەك دەمانکوژن ؟ ))

ژنەکەی لە کاتێکدا چاوە ڕەش و ترساوەکانی ئەبڵەق بوبون، وتی : (( سەگەکان لەگەڵ خۆیان دەهێنن و ئنجا...))

ژنەکەی نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات و دووبارە دەستی کردەوە بە گریان، هەر بەدەم گریانەوە هەر چوار بێچوکەی‌هێنایە تەنیشت خۆیەوەو توند باوەشی پێداکردن. ئەم دەنگە تۆقێنەرە بیرۆکەیەکی لای مام ڕێوی خولقاند. مام ڕێوی هاواری کرد : (( دۆزیمەوە وەرن هێشتا کات ماوە، چۆن پێشتر بیرم لێ‌ی نەکردبووە؟ ))

یەکێك لە بچوەکان پرسی : ((باوکە چ بیرێك ؟ ))

مام ڕێوی دیسانەوە هاواری کردەوە : (( ئەوەی، لەم سەرزەوییەدا کەس نیەبتوانێت لە ڕێوی‌یەك خێراترو باشتر زەوی هەڵکەنێ. ))

مام ڕێوی لەو کاتەی دەستی بە هەڵکەندن کردبو، وتی : (( لە دونیادا کەس ناتوانێ لە هەڵکەندن دا شان لە شانی ڕێوی بدات. ))

خاکو خوڵێکی زۆر لە پشتی سەری مام ڕێوی‌یەوە دەچو بە ئاسمان دا. مام ڕێوی لەبەر خاتری ڕزگارکردنی گیانی شیرینی خۆی‌ی و خێزانەکەی بەپەلە کاری دەکرد ، بەهەر چوار پەل زەوی هەڵدەکۆڵی. ژنەکەیشی بەپەلە کەوتە هاوکاری کردنی مێردەکەی، هێندەی پێنەچو بێچوەکانیش خۆیان گەیاندە باوك و دایکیان.

مام ڕێوی فەرمانی دا :(( زیاتر ڕۆچن! ئێمە پێویستیمان بە کونێکی قوڵ هەیە تا گیانمان ڕزگار بکات . ))

بەهەوڵ و ماندوبونی مام ڕێوی و خێزانەکەی کونەکە وردە وردە درێژتر دەبو تا گۆڕا بە تونێلێك، هەمویان کونەکەیان بەرەو قولایی دەبرد.

مام ڕێوی و ژنەکەی و چوار بێچوی زیرەك و زیتەڵە خەریکی هەڵدەندن بون ٠ هێندە بە خێرای کاریان دەکرد، بە ئاسانی دەست و قاچیان لە یەکتری جیا نەدەکرایەوە ٠

وردە وردە دەنگـــی بێڵـــەکان دور دەکەوتنـــەوە. دوای تێپـــەڕبونی نزیکـــەی سەعاتێك، مام ڕێوی وەستاو،وتی: (( ئیتر بەسە ! ))

هـەموو دەسـتیان لـەکار هـەڵگرت. گەڕانـەوە بـۆ تەماشـاکردنی ئـەو تونێلـەی دروستیان کردبو، هـەمو کـزو بێدەنگ بـون، مام ڕێـوی وتـی: (( پێم وایە ئیتر بەس بێت چونکە ناتوانن هێندەی ئێمە هەڵکەنن. هەر بژین و ماندو نەبن!.))

هەمو دانیشتن و هەناسەیەکی ئۆخەیان هەڵکێشا. ژنەکەی رویکردە بێچوەکانی و، ووتـی: (( دەبـێ بزانن ئەگـەر باوکتـان نەبوایە ئێسـتا هـەمومان کوژرابویـن، باوکتان بەراستی ڕێوییەکی سەرسورهێنەرە... ))

مام ڕێوی سەیرێکی هاوسەرەکەی کردو ئەویش بەپێکەنین وەڵامی دایەوە.

## ٥- تراکتۆرە سامناکەکان :

مامران، قازیان و سێوان تا گزنگ خەریکی هەڵکەندن بون، چاڵێکی گەورەیان لێدا، چاڵەکە ئەوەندە گەورە بوو بە ئاسانی خانویەکی تیا دروست دەکرا، بەڵام هێشتا کونەکە دوایی پێنە هاتبو کە هەمویان پەست و ماندو بوبون.

مامران وتی: (( ئەم حەیوانە نەفرەتییە لە ( با ) دەچێ! ئەم هەڵکەندنە تەگبیری کێ بو؟ ))

قازیان وتی : (( تەگبیری سێوان بو. ))

مامران و قازیان مۆرەیەکیان لە سێوان کرد، سێوانیش لەو کاتەدا کە شەربەتی سێوی دەخواردەوە بە تورەییەوە وتی: (( ئەو ڕێوییە نەفرەتییەم دەوێ! هەر دەبێ بیگرم. لێرە ناڕۆم تا مام ڕێوی لە کونەکەی دەرنەهێنم و کەوڵەکەیشی بە بەرهەیوانی ماڵەکەمەوە هەڵنەواسم. ))

- مامران لەو کاتەی لەشە قەڵەوەکەی دەلەرانەوە وتی: (( تا توانیمان چاڵمان هەڵکەند لەبەرئەوە بەم کارەمان ناتوانین مام ڕێوی دەستگیر بکەین. ))

قازیان ورگە زلەکەی وەرچەرخاند و سەری بەرزکردەوە و مۆرەیەکی لە سێوان کردو، وتی : (( دیسانەوە پێشنیازێکی گێلانەی ترت هەیە یا نا ؟ ))
سێوان وتی: ((گوێم لە قسەکانت نیە . ))
سێوان قەت نەڕۆیشتبو بۆ حەمام و خۆی نەدەشۆری بۆیە هەردو کونە گوێچکەی پڕ بون لە چڵك و پیسی و ووردە بنێشت و شتی تری لەو بابەتە ئەمەش گوێی زۆر گران کردبو. لەبەرئەوە بە دەنگێکی بەرز بە قازیانی وت:
- دەنگت بەرز کەرەوە! تێنەگەیشتم چیت وت؟
قازیان هاواری کرد: (( ئایا هیچ پێشنیازێکی گێلانەی ترمان هەیە یا نا؟ ))
سێوان لە کاتێکدا بە پەنجە ملە چڵکنەکەی دەخوراند، وتی: (( بۆ ئەم کارە پێویستیمان بە چ شتێك هەیە؟ بەڵێ، ماشین... تراکتۆر... لەگەڵ بێڵی میکانیکی( حەفارە ). بە بێڵی میکانیکی دەتوانین لە ماوەی پێنج دەقیقەدا مام ڕێوی بهێنینە دەرەوە. ))
بیرۆکەیەکی خراپ نەبو، بۆیە مامران و قازیان دیسانەوە پێی قاییل بونەوە.
سێوان وتی: (( زۆر چاکە، تۆ، مامران لێرە بمێنەرەوە ئاگاداربە تا مام ڕێوی رانەکات. من و قازیانیش دەڕۆین تراکتۆرەکان دەهێنین. ئەگەر مام ڕێویش هاتە دەرەوە بە فیشەکێك بیکوژە!))
سێوان بەو قەدو بالاّ بەرزە و هەنگاو زلانەیەوە بە ڕێکەوت و قازیانی کورتە بنەش بە دوایدا رایدەکرد. مامرانیش لە هەمان شوێن دا بە تفەنگێکەوە بە دیار کونەکەوە وەستا.
بە زوترین کات، دو تراکتۆری زەبەلاح و دو بێڵی میکانیکیان هێنا. قازیان تراکتۆرێکی لێدەخوڕی و سێوانیش تراکتۆرەکەی تریان.
ڕەنگی تراکتۆرەکان ڕەشبون و لە جیاتی تایەی لاستیك، زنجیریان هەبو، هەر لە زنجیری تانك دەچون. لە دو دێوی ترسناك و بێ بەزەیی دەچون. سێوان هاواری کرد، ئێمە ... لێرەین
قازیان قیراندی
بمرێ ... ڕێوی...

تراکتۆرەکان دەستیان بە کار کرد. زۆر بە خێرای خاکو خۆڵی دەم کونەکەیان لادەداو بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتن.

هێزو خێرایی و تەکانە توندەکانی تراکتۆرەکان پیرەدارەکەی بەلادا خست، لەهەموو لایەکەوە تۆزو خۆڵ دەچو بە ئاسمان دا، نەمامەکان بە خێرایی دەکەوتن، دەنگی تراکتۆرەکان ئەو ناوچەیەی هەراسان کردبو. لەناو تونێلەکەشدا ڕێوی‌یەکان گوێیان لەو دەنگە تۆقێنەرە گرتبو کە لە ژور سەریانەوە بەرپا بوبو.

بێچوە ڕێوی‌یەکان دەیانپرسی: (( چ ڕویداوە؟ ئەوانە چ دەکەن؟ ))

ژنەکەی بەدەم گریانەوە هەر بۆڵەی دەهات: (( بومەلەرزەیە! بەڵێ بومەلەرزەیە!))

یەکێك لە بێچوە ڕێوی‌یەکان وتی: (( تەماشاکەن، تونێلەکەمان تا دێت کورتتر دەبێتەوە! دەتوانم بە ئاسانی تیشکی خۆر ببینم.))

هەمو تەماشای دەمی تونێلەکەیان کرد. بەڵێ! دەمی تونێلەکە زۆر لێیانەوە نزیك بو.

لە ڕوناکی دەمی کونەکەوە سێبەری دو تراکتۆری زل و زەبەلاح و سامناك دەبینران مام ڕێوی هاواری کرد : (( تراکتۆرە بەدفەڕەکان! بێڵەکان! ئەوانەیان هێناوە تا بمانگرن. زۆر چاکە! ئێمەش ئامادەین! بجەنگن تا بجەنگین! خانمەکەم! ڕۆڵەکانم! دەست پێبکەن، هەڵکەنن... هەڵکەنن... هەڵکەنن...))

## ٦- پێشبڕکێ:

ئێستا لەوێ پێشبڕکێیەکی زۆر سەخت و دژوار دەستی پێکردوە. پێشبڕکێی نێوان تراکتۆرو ڕێوی‌یەکان! زۆری نەبرد چاڵەکە زۆر گەورەتر بو. دوای تێپەڕبونی سەعاتێك، بێڵەکان خاکو خۆڵێکی زۆریان دەردا و چاڵێکی مەزنیان دروست کرد.

هێندێ جار، ڕێوی‌یەکان لە هەڵکەندنی تونێلەکەدا پێش تراکتۆرەکان دەکەوتن و دەنگی زنجیری تراکتۆرەکان دور دەکەوتنەوە. لەو ساتانەدا مام ڕێوی دەیوت:

(( چاریان دەکەین! دڵنیام کە ئێمە سەرکەوتوین! )) دوای چەند دەقیقەیەك تراکتۆرەکان پێیان دەگەیشتنەوە و بە گرمو هوڕێکی زیاترەوە دەیتۆقاندن .

لەناکاو ڕێوی‌یەکان چاویان بە بێڵەکە کەوت کە بە دوری چەند پێیەك لێیانەوە خۆڵەکەی بەردەمیانی لادەبرد.

مام ڕێوی لە کاتێکدا هەناسە بڕکێی پێکەوتبو، وتی:

(( ئازیزەکانم، بەردەوام بن، ئێمە سەرکەوتوین!))

لە هەمان جیگەشدا مامران هاواری کرد: (( بەردەوام بن، هەر ئێستا بە دەست دەیانگرین. ))

سێوان بە نارەحەتییەوە نەڕاندی : (( ئێمە تاکو ئێستا تەنانەت سێبەری ڕێوی‌یەکەشمان نەدیوە... ))

مامران هاواری کرد: (( هێشتا، نا. بەڵام لەو باوەڕەدام هەر چەند پێیەك لێمانەوە دورە! ))

قازیان هاواری کرد : (( یەکەمجار بە سەتڵ سەری دەخەمە سەرەوە ئنجا لە توپەتی دەکەم. ))

کاتی نیوە ڕۆژە هاتبو، هێشتا تراکتۆرەکان لە گەرمەی ئیشدا بون، ڕێوی‌یەکانیش بێبەخت و بێچارە بوبون. ئیتر چاڵەکە بە تەواوی فراوان و گەورە و قوڵ کرابو. خاوەن کێڵگەکان بۆنان خواردنی نیوەڕۆیش دەستیان لە ئیش هەڵنەگرت چونکە دەیانویست بە زوترین کات کۆتایی بە ئیشەکەیان

بهێنن. جاروباریش قازیان لە خۆشیدا هاواری دەکرد: (( ئاهای... مام ڕێوی لێرەیە. ))

ئنجا لە تراکتۆرەکەی دابەزی و درێژەی بە قسەکانی دا: (( هێی... ! هەر ئێستا دەیکوژم. ))

مامران دەینەڕاند : (( ئیتر هەرگیز مریشکەکانمان ون نابن . ))

سێوان دەیوت: ( ئیتر لەمەودوا شەوانە بە دوای ڕاوکردنی مام ڕێویدا کۆڵانەو کۆڵان ناکەین. )

بەڵێ، هەر سێکیان لەبەر توڕەیی و نارەحەتی خەریك بو شێت دەبون و شێتانەش ڕەفتاریان دەکرد.

سێوانی لەڕو لاوازو درێژو پیس، قازیانی کورتە بنی ورگن شێتانە شۆفێریان دەکرد. هەروەها بەو پەڕی تواناوە کاریان بە تراکتۆرەکان دەکرد و سودێکی بێپایانیان لە بێڵەکانیش وەردەگرت.

مامران وەکو شێت دەینەڕاند:

(( توند تر... توندتر... ))

لە سەعات پێنجی پاش نیوەڕۆدا نە گردێك مابو، نە دارستان و نە پیرە دار جگە لە چاڵێکی گەورەو قوڵ هیچ شتێکی تر لە شوێنی خۆیدا نەمابو.

تراکتۆرەکان بێ ئامان کاریان دەکرد و لولەی ئەگزۆزەکانیان چەشنی گڕکان ئاگری لێدەباری.

هەرایەکی زۆر کە بوە مایەی ئەوەی خەڵکی گوندەکانی دەوروبەریش بێن بۆ تەماشاکردنی ئەو دیمەنە سەیرە و زۆر بە سەرسورمانەوە لە کەناری چاڵەکە وەستابون و تەماشای مامران و قازیان و سێوانیان دەکرد...

- ئەوەتا لێرەیە. مامران ! لەوێ ئیشت چییە؟ ئێرە هەڵکەنە!
- ئێمە ڕێوییەکمان دەوێ.
- ئێمە دەبێ شێت بین.

خەڵکی لەسەروی چاڵەکەوە پێیان پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکردن. پێکەنینی خەڵکەکەش هەر سێکیانی هوروژان تا بەسەر سەختییەکی زیاترەوە درێژە بە ئیشەکەیان بدەن و بڕیاریش بدەن تا مام ڕێوی نەگرن دەست لەکارهەڵنەگرن .

## ٧- هەرگیز ڕێگە نادەین مام ڕێوی رابکات:

لە سەعات شەشی پاش نیوەڕۆ، سێوان و قازیان تراکتۆرەکانیان کوژانەوە و دەستیان لە کار هەڵگرت.

ئەمڕۆ ئەوەندە بەسە، بە هۆی قورسی کارەکانیانەوە زۆر ماندو بون. هەروەها برسی و تینوش بون. لەسەرخۆ بەرەو کەناری چاڵەکە ڕۆیشتن کە کونە ڕێوییەکەی لێبو. سێوان لە تورەیی و نارەحەتی دا سور هەڵگەڕابو. قازیانیش جنێوی ناشیرینی بە مام ڕێوی دەدا.

مامران لەو کاتەی لەبەر ناقولایی چاڵەکە بە زەحمەت هەنگاوی دەنا، وتی:

(( ئەم ئاژەڵە نەفرەتیە لە (با) دەچێ! ئێستا چ بکەین ؟ ))

سێوان وتی: (( هەر ئێستا پێتان دەڵێم کە چ بکەین. بەڵێ، دەبێ نەهێڵین بە هیچ جۆرێك مام ڕێوی را بکات.))

قازیان قسەکانی سێوانی سەلماند .

- بەڵێ، نابێ بهێڵین مام ڕێوی ڕا بکات.

سێوان بەدەم هاوارەوە سەری بردە ناو کونەکەوە و نەڕاندی: (( جەنابی مام ڕێوی خۆ گوێت لێبو هێشتا ؟! ئیشمان تەواو نەبوە. ناڕۆینەوە تا نەتکوژینو وەکو شتێکی پیس لەناوت نەبەین. ))

ئەو سێ پیاوە لە کاتێکدا لەبەر رق و تورەیی دەستیان دەلەرزی، دەستی یەکتریان گرتبو، و جنێوی ناشیرینیان بە مام ڕێوی دەدا، جارێکی تر زۆر بە جیدی سوێندیان خواردەوە تا مام ڕێوی دەسگیر نەکەن، بۆ ناو ماڵ و حاڵی خۆیان نەگەڕێنەوە.

قازیان پرسی: (( ئێستا چ بکەین؟ ))

سێوان لەو کاتەی خۆی دانەواندبووە بە قازایانی وت: (( تۆ دەنێرینە خوارەوە بۆ ئەوەی لەبەردەم کونەکە بوەستی و چاودێری کونەکە بکەیت تا مام ڕێوی رانەکات. ))

قازیان کە دەیویست بروات، وتی: (( من ؟! نا ! دەبێ خۆت بڕۆیت، گێلە پیاو!))

سێوان پێکەنی و دانە پیس و ترسناکەکانی دەرکەوتن.

قازیان درێژەی بە قسەکانیدا: (( دەبێ تەنها کارێك ئەنجام بدەین، بەڵێ! دەبێ بیکوژین. شەو و ڕۆژ لێرە دەمێنینەوە و چاودێری کونەکە دەکەین تا ناچار دەبێ بێتە دەرەوە. هەر دەبێ بێتە دەرەوە. ))

مامران، قازیان و سێوان یەکێکیان راسسپارد کە بە زوترین کات لە کێڵگەکانیانەوە خێوەت و قەرەوێڵەو کورسی و خواردنیان بۆ بهێنن.

## ٨-برسێتی ڕێوی‌یەکان دەست پێ دەکات:

هەر ئەو شەوە سێ خێوەت لە دەوری کونەکە بۆ مامران، قازیان و سێوان هەڵدرا. خاوەن کێڵگەکانیش لە دەرەوەی خێوەتەکانیان خەریکی شێو خواردن بون. مامران سێ مریشکی قەڵەوی سورەوە کراوی لەبەردەستدا بو. قازیان شەش کولێرەی گەورەی پێبو کە دوتویان پڕ بون لە دڵ و جگەری قاز، بۆ سێوانیش دوگالۆنی گەورەی شەربەتی سێویان هێنابو. هەرسێکیان تفەنگەکانیان لە تەنیشت خۆیانەوە دانابو.

مامران هەستایە سەرپێ و یەکێك لەمریشکەکانی نزیك کونەکەی خستەوە و هاواری کرد: (( مام ڕێوی دەتوانی بۆنی بکەیت؟ چەند مریششکێکی بەتامە؟ بۆچی نایەیت پڕێکی پیا بکەیت و بیخۆی؟ ))

بۆنی مریشکە سورەوەکراوەکە ناو تونێلەکەی گرتەوە.

یەکێك لە بێچوەکان وتی: (( باوکە،ئایا ناتوانین زۆر بە وریایی‌و مارئاسا بچینە سەرێ و ئەو مریشکە لە دەستیان بفڕێنین؟ ))

مام ڕێوی وتی : (( نا، ناتوانین، ئەمە ڕێك هەمان ئەو شتەیە کە ئەوان مەبەستیانە . ))

بێچوەکان بەدەم ناڵەو گریانەوە وتیان : (( بەلام ئێمە برسیمانە، تاکەی دەتوانین بەرگەی برسێتی بگرین؟))

مام ڕێوی و خێزانەکەی وەلامیان نەدانەوە...

کە دونیاش تاریك بۆ قازیان و سێوان گلۆپە گەورەکانی تراکتۆرەکانیان هەڵکردو روناکییەکەیان کردە کونەکە.

سێوان وتی: (( ئێستا پێویستە بە نۆرە ئێشك بگرین. دو کەس دەخەون و یەکێکیش بە خەبەر دەبێ، پاشان نۆرە یەکێکی ترە. ))

مامران وتی: (( چیە؟ ئەگەر مام ڕێوی کونێکی تر بکات و لە شوێنێکی ترەوە بێتە دەرەوە، دەبێ چ بکەین؟ ئایا بیرتان لەو مەسەلەیە کردۆتەوە؟ ))

مامران وتی: (( چییە؟ ئەگەر مام ڕێوی کونێکی تر بکات و لە شوێنێکی ترەوە بێتە دەرەوە، دەبێ چ بکەین؟ ئایا بیرتان لەو مەسەلەیە کردۆتەوە؟ ))
سێوان لە کاتێکدا واخۆی پێشان دەدا کە ئاگاداری مەسەلەکەیە، بە پەلە وتی: (( هەڵبەتە بیرم لێکردۆتەوە!))
مامران درێژەی بە قسەکانی دا: (( زۆری لەسەر مەڕۆ، ئەگەر شتێك دەزانی، مەیشارەوە. ))
سێوان لە کاتێکدا بە پەنجە گوێچکە پیسەکەی دەخوراند، رویکردە مامران و، وتی: (( چەند پیاو لە کێڵگەکەت دا کار دەکەن؟ ))
مامران وتی: (( ٣٥ کەس ))
قازیان وتی: (( منیش ٣٦ کرێکارم هەیە. ))
سێوان وتی: (( خۆشم ٣٧ کەسم هەیە. تێکرا هەموی دەکاتە ١٠٨ کەس. دەبێ پێیان بڵێین هەمویان لێرە ئامادەبن و هەریەکەیان لایتێك و تفەنگێك لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. ئەو کاتە هیچ ڕێگەیەك بۆ راکردنی مام ڕێوی نامێنێتەوە. ))
بەمجۆرە یەکێك ڕۆیشت بۆ کێڵگەکان و هەر ئەو شەوە ١٠٨ پیاو لەگەڵ ١٠٨ تفەنگ و دەمانچەو چەکی کوشندەی جۆراوجۆر و ١٠٨ لایت بە هەمو لایەکدا بڵاوبونەوەو کەوتنە ئێشك گرتن.
ئەم کارە هاتنە دەرەوەی مام ڕێوی و ئەو گیانلەبەرانەی تریش کەلەژێر زەویدا دەژیان زۆر زەحمەت کرد. بۆ ڕۆژی دواتریش هەمو کەوتنە ئێشك گرتن و چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی مام ڕێوی بون.
مامران، قازیان و سێوان هەریەکەیان بە تفەنگێکەوە لەسەرکورسییەك دانیشتبون و تەماشای کونەکەیان دەکرد. زۆریش پێکەوە قسەیان نەدەکرد. چاوەروانی هاتنە دەرەوەی مام ڕێوی بون.
زۆرجاریش مام ڕێوی نزیکی دەمی تونێلەکە دەکەوتەوەو بۆنی دەکرد و ئنجا دەگەڕایەوە و دەیوت: (( هێشتا نەڕۆیشتون . ))
ژنەکەی دەیپرسی: (( ئایا دڵنیای؟ ))

مام ڕێوی دەیوت: (( بەڵێ، دڵنیام، دەتوانم لەدووری دوکیلۆمەترەوە بۆنە ناخۆشەکەی سێوان دەست نیشان بکەم. بۆنی گەنیوی لێدێت! ))

## ٩- مام ڕێوی پلانێکی هەیە:

سێشەو، و سێ ڕۆژ چاوەڕوانی درێژەی کێشا. لە ڕۆژی سێیەمدا مامران پرسی : (( ئەرێ، ڕێوی تا چەند ڕۆژ دەتوانێ بەرگەی برسێتی و تینویتی بگرێ؟. ))

سێوان وتی: (( ڕێوی ناتوانیت ماوەیەکی زۆر بە برسێتی بمێنێتەوە، هەر زۆر زوو ناچار دەبێت بێتە دەرەوە!))

سێوان قسەکانی ڕاست بون، لەناو تونێلەکەدا ڕێوی‌یەکان بە هێمنی گیانیان دەسپارد.

یەکێك لە بێچوەکان پرسی: (( ئاخ بۆ قومێك ئاو... باوکە ... ئایا ناتوانین کارێك ئەنجام بدەین؟... ئایا ناتوانین بە خێرایی رابکەین؟... باوکە لەوانەیە تۆزێك شانسمان هەبێ... وانیە؟ ))

مام ڕێوی لەسەرخۆ وتی: (( نەمهێشت بڕۆنە دەرەوە تا ڕوبەڕوی چەکەکانیان نەبنەوە. ئێوەم لێرەدا هێشتۆتەوە تا بە هێمنی و ئارامی گیان بسپێرن. ))

مام ڕێوی ماوەیەکی زۆر قسەی نەکرد. بە بێدەنگی دانیشتبو، و چاوەکانیشی نوقاندبو تەنانەت گوێی لێنەبو ئەوانەی تریش چ دەڵێن.

مام ڕێوی بیری دەکردەوە چۆن ڕێگەیەك بدۆزێتەوە بۆ دەرباز بون. ژنەکەی تەماشایەکی مام ڕێوی کرد. مام ڕێویش بەهەمان شێوە تەماشای هاوسەرەکەی کردەوە.

ژنەکەی لەسەرخۆ کەوتە جوڵە. لەناکاو تروسکاییەك لە چاوانی مام ڕێوی درەوشایەوە .

ژنەکەی هەستی پێکرد و لێی پرسی: (( دەتەوێ شتێك بڵێی؟! ))

مام ڕێوی وتی : (( پلانێکی بچکۆلانەم هەیە . ))
بێچوەکان پرسیان: (( پلان؟... باوکە...چ پلانێك ! ))
ژنەکەی وتی: (( خێراکە. قسە بکە. ))
مام ڕێوی هەستایە سەرپێو هەناسەیەکی هەڵکێشا، لەکاتێکدا سەری دانەواندبو دوبارە دانیشتەوە، وتی: (( نا... پلانێکی گونجاو نیە... نا ... ناتوانین. ))
یەکێك لە بێچوەکان وتی: (( بۆچی نا . باوکە ؟ ))
مام ڕێوی وتی: (( چونکە دەبێ زیاتر زەوی هەڵکەنین و ڕۆچین، ئێستایش دوای تێپەربونی سێ شەو، و سێ ڕۆژ بەبێ خواردن و خواردنەوە ئیتر هێزو توانای ئەو کارەمان نەماوە ))
یەکێك لە بێچوەکان وتی: (( بەڵێ باوکە... پێمان ناکرێ... ناتوانین.))
بێچوەکە لە پشتی باوکییەوە پرتەی کردو درێژەی بە قسەکانی دا: (( بەڵێ ... ئێمە ناتوانین... بەڵام خۆ تۆ دەتوانی. ))
مام ڕێوی چاوێکی بە منداڵەکانیدا داگێڕاو خەندەیەکی کردو کەوتەوە بیر کردنەوە: (( چەندە منداڵەکانم باشن! لەسەرەمەرگدا دەژین. سێ شەو، و سێ ڕۆژە هیچیان نەخواردوە لەگەڵ ئەوەشدا هەر کوڵ نادەن! کەواتە دەبێ نەهێڵم بمرن! ))
مام ڕێوی وتی: (( زۆر باشە، ئێمە هەوڵی خۆمان دەدەین! ))
یەکێك لە بێچوەکان پرسی: (( باشە باوکە، ئێستاپێمان بڵێ، ئێمە چیمان لە دەست دێت تا ئەنجامی بدەین؟ ))
لەوکاتەشدا ژنەکەی بە پێوە وەستابو. لەبەر بێ خواردن و بێ ئاوی حاڵی لە هەمویان پەرێشانتر بو وتی: (( باوەڕناکەم هیچم پێبکرێت. ))

مام ڕێوی وتی: (( ڕۆڵەکانم، دایکتان ڕاست دەکات، وەرن با خۆمان ئەم کارە ئەنجام بدەین. ))

## ١٠- کولانەی ژمارە یەکی ماموران:

مام ڕێوی لە کاتێکدا بیری لە ڕێگەیەکی قەدبڕ دەکردەوە، وتی: (( پێویستە کارێکی ئاڵۆزو لێزانانە ئەنجام بدەین . ))
ئیتر خۆی و هەر چوار بێچوەکەی دەستیان بەهەڵکەندن کرد. کارەکەیان زۆر بە سستی بۆ هەڵ دەسوڕا بەلام زۆر بە ئازایانە و بوێرانە کاریان دەکرد و وردە وردە تونێلەکەش بۆ پێشەوە دەڕۆیشت.
یەکێك لە بێچوەکانی پرسی: (( باوکە ... زۆر حەز دەکەم بزانم بۆ کوێ دەڕۆین؟))
مام ڕێوی وتی : (( ئەگەر ڕاستت دەوێ، ناوێرم بڵێم بۆکوێ دەڕۆین، چونکە ئەوێ جێگەیەکی زۆر دڵڕفێن و سەرسوڕهێنەرە، هەڵبەتە ئەگەر بتوانین بڕۆین، ئەگەر ناوی جێگەکەتان پێ بڵێم ڕەنگە بەشێتم بەقەڵەم بدەن، بەلام ئەگەر پێی بگەیین لە خۆشیان پەروباڵ دەردەکەن .. هەڵبەتە نامەوێت لەمە زیاتر هیوادارتان بکەم خۆشەویستەکانم،پێویستە هەمو توانایەکی خۆمان بخەینە گەڕ. ))
ماوەیەکی زۆر هەمو خەریکی هەڵکەندن بون. چەندێکی خایاند؟ نازانن، لەبەر تاریکی تونێلەکە شەو، و ڕۆژ لە یەکتری جیانەدەکرانەوە.
سەر ئەنجام کارەکەیان دوایی پێهات و مام ڕێوی فەرمانی دا، دەست لەکار هەڵگرن. پاشان وتی: (( ئێستا دەبێ ژور سەرمان کون بکەین، تا بزانین بەکوێ گەیشتوین.هەڵبەتە دەزانم بە کوێ گەیشتوین. بەلام دەبێ دڵنیابم لەوەی کەهەڵەم نەکردبێ. ))

ڕێوی‌یەکان زۆر وریایانە دەستیان بە هەڵکەندنی ژور سەریان کرد تا گەیشتنە شتێکی ڕەق کە بە ئاسانی کون نەدەکرا.

مام ڕێوی ئەو شت ڕەقەی تاقیکردەوە،، ئنجا وتی: (( ئەمە دارە. ئێمە گەیشتوین بە تەختە دارەکان. ))

یەکێك لە بێچوەکان پرسی: (( ئەمە مانای چیە؟ ))

مام ڕێوی وتی: (( مانای ئەوەیە ئێمە لەژێر ژورێکین، کەمێك دان بە خۆتان دا بگرن تا بە ئەسپایی تەماشایەکی بکەم. ))

مام ڕێوی زۆر بە وریایی‌و لەسەرخۆ یەکێك لە تەختەکانی ناو ژورەکەی بۆ سەرەوە هەڵدایەوە تەختەیەکە جیرەیەکی کرد، هەمو خۆیان هەڵدایە خوارەوە و ماوەیەك چاوەڕوانی بون بەڵام هیچ شتێك روینەدا. مام ڕێوی دوبارە سەرکەوتەوەو تەختەیەکی تری هەڵدایەوە. پاشان زۆر بە وریایی سەری لە نێوان کونی تەختەکان بردە ژورەوە،، زۆر بە خۆشی و شادییەوە وتی:

(( سەرکەوتین! سەرکەوتین! ))

مام ڕێوی چوە سەرەوەو لە خۆشیان کەوتە سەماکردن : (( وەرنە سەرەوە.. خێراکەن.. وەرن . تەماشاکەن. خۆشەویستەکانم، چەند دیمەنێکی جوانە! ئەمە جوانترین دیمەنی سەر روی زەوی‌یە بۆ ڕێوی‌یە برسییەکان.. خوای گەورە! ))

هەر چوار بێچوە ڕێوی‌یەکە چونە سەرەوە چاویان بە دیمەنێکی زۆر سەرسوڕهێنەر کەوت!

حەوشەیەکی گەورەی تۆکمەو قایم کە پڕ بوو لە مریشك. مریشکی سپی، قاوەیی، ڕەش، دەیان... سەدان... .

مام ڕێوی هاواری کرد: (( کولانەی ژمارە یەکی مامران! ئەمە ئەو شوێنەیە کە بڕیارم دا بیدۆزمەوە.

ڕۆڵەکانم، ئایا ئەمە روداوێکی سەیرو سەمەرە نیە.. ئێستا پێم وایە باری ژیانمان زۆر لە جاران باشتر دەبێ..))

بێچوە ڕێوییەکان لە خۆشیان کەوتنە مریشك گرتن

مام ڕێوی فەرمانیدا: (( کوڕپەکانم! ڕاوەستن! شێت مەبن! بگەڕێنەوە! بۆچی لە ژیانی خۆتاندا ڕەچاوی ڕەوشتی جوان ناکەن؟ پێویستە لە پێش خواردن دا ئاو بخۆنەوە . ))
ڕێوییەکان گەڕانەوە بۆبەشی ئاو خواردنەوەو تێر ئاوی ساردیان نۆش کرد.
مام ڕێوی سێ مریشکی قەڵەوی هەڵبژارد و لەچاو تروکانێکدا پڕی پیاکردن و هەرسێکیانی بەدان گرت.
ئنجا فەرمانی دا: (( با بگەڕێینەوە بۆ تونێلەکە. دەبێ بە زوترین کات لێرە بڕۆین. خێراکەن! دوانەکەون.
خێرا.. ئێستا خواردنی بە چێژو بەتاممان هەیە.پێویستە هەرچی زوترە ئێرە بەجێ بهێڵین.))
ڕێوییەکان بە ڕیز لە کونی کولانەکەوە بۆ تونێلە تاریکەکە گەڕانەوە.
مام ڕێوی تەختەکانی سەرکولانەکەی زۆر بە وریاییو لێهاتویی وەکو جاران دانایەوە تا کەس پەی بەم ڕێگە شاراوەیە نەبات. پاشان ئاماژەی بۆ بێچوە گەورەکەی کردو، وتی: (( کوڕەکەم، ئەم سێ مریشکە قەڵەوە بگرەو بڕۆ بۆلای دایکت و پێی بڵێ خواردنی میوانییەک ئامادە بکات ، هەروەها پێی ڕابگەیەنە ئێمەش دواناکەوین هەرئەوەندەمان پێ دەچێت تا بەشی میوانییەکی تر خواردن دابین دەکەین. ))

## ١١ـــ مۆژدەیەك بۆ هاوسەرەکەی مام ڕێوی:

ڕێوییە خنجیلانەکە هەرسێ مریشکە قەڵەوەکەی هەڵگرت و زۆر بە خێرایی گەڕایەوە بۆلای دایکی. لە کاتێکدا بەو سەرکەوتنە زۆر شادمان بو، لەبەرخۆیەوە دەیوت: (( ئەگەر چاوی پێیان بکەوێت؟ خوای گەورە! ئەگەر دایکم ئەم مریشکانە ببینێ؟!))
بێچوە ڕێوییەکە ڕێگەیەکی دورودرێژی لەپێش بو تا بگاتە لای دایکی بۆیە بۆ تەنها ساتێکیش لە هیچ شوێنێك خۆی گیر نەکرد.

بێچوە ڕێوی‌یەکە هەر کە چاوی بە دایکی کەوت، بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: (( هەڵسە! سەرنج بدە، تەماشاکە چیم بۆ هێناوی! ))

دایکی لەبەر ئەوەی هەرگیز چاوەڕوانی خواردن نەبو بۆیە چاوێکی کردەوەو سەرنجی مریشکەکانی داو، وتی: (( چ خەوو خەیاڵێکی خۆشە! )) دوبارە چاوی نوقاندەوە.

بێچوەکە هاواری کرد: (( دایکە نەخەوەو نە خەیاڵە ، مریشکی راستەقینەن . ڕزگارمان بو . ئیتر لە برسان نامرین. ))

خاتو ڕێوی هەردوچاوی کردەوەو بە دانیشتنەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا: (( کۆرپەی شیرینم! لە کوێ ئەم مریشکانەتان دەست کەوت؟ ))

بێچوەکە بە شادمانییەوە، وتی: (( لە کولانەی ژمارە یەکی مامران! ئێمە بەردەوام خەریکی هەڵکەندن بوین تا تونێلەکەمان گەیاندە ژێر کولانەکە، ئنجا چوینە ناو کولانەکەوە. بەدرێژایی تەمەنمان مریشکی گەورەو قەڵەوی لەو جۆرەمان نەدیبو. باوکم دەیوت دەبێ داوەتێك بکەین.. هەرئێستا ئەوانیش دەگەڕێنەوە.))

جوانی دیمەنی خواردنەکە گیانێکی تازەی بە خاتو ڕێوی بەخشی بۆیە هەستایە سەرپێو ، وتی : (( بەڵێ، راست دەکات، داوەتێکی گەورە! لە راستی‌دا دەبێ لەگەڵ ئەم خواردنەدا بیکەین بە جەژن... ئاە ... خوای گەورە، باوکت چ ڕێوی‌یەکی سەرسوڕهێنەرە! خێراکە ڕۆڵە! ))

خاتوو ڕێوی دوای ئەم قسانەی دەستی کرد بە پاککردنی مریشکەکان. لەو لایشەوە مام ڕێوی دەیوت: (( خۆشەویستەکانم، هەر ئێستا پێویستە بیر لە هەڵکەندنی تونێلێکی تر بکەینەوە.. هەڵبەتە ئەمەیان ئاسانترە... ...خێراکەن ... لێرەوە... تائێرە...

یەکێك لە بێچوە ڕێوی‌یەکان پرسی: (( لە کوێوە .. تا کوێ؟. ))

مام ڕێوی وتی : (( بەبێ پرسیار.. تەنها هەڵکەنن و هیچی تر. ))

## ١٢- خاڵخاڵ:

مام ڕێوی و سێ بێچوەکەی بە جۆش هاتبون و بەرێکیو بە خێرایی تونێلەکەیان هەڵدەکەند. هەرچەندە برسیان بو بەڵام دەیانزانی پاش ماوەیەکی تر داوەتێکی گەورەو چەوریان دەبێ. مام ڕێوی کەمێك بیری لە خاوەن کێڵگەکانیش کردەوە. ئەو کێڵگە دارانەی لەدەرەوە دانیشتبون و چاوەڕوان بون تا مام ڕێوی دەرچێتە دەرەوە. لەکاتێکدا مام ڕێوی نەك هەر مەبەستی نەبو بچێتە دەرەوە بەڵکو بە شادییەوە بەبێ ئەوەی خاوەن کێڵگەکان بە خۆشیان بزانن خواردنەکەشی لێ وەردەگرتن. یاد کردنەوەیەکی خراپ نەبو.

مام ڕێوی وتی: (( بەردەوام بن.. هێشتا زۆرمان ماوە. ))

لەناکاو لە ژوور سەریانەوە گوێیان لە دەنگێك بو کەوتی: (( کێ بو لێرەوە تێپەڕی؟ ))

ڕێوییەکان بەو دەنگە حەپەسان و تەماشایەکی ژور سەری خۆیان کرد، وردە وردە کونێکی بچوك لە بنمیچی تونێلەکە پەیدا بو و کەللەی گیانەوەرێکی کوڵکنی پێست نەرم دەرکەوت.

مام ڕێوی وتی: (( ئەمە گوڕ هەڵکەنەیە. ))

گیانەوەرەکە هێشتا بەباشی نەیدەزانی ئەوانە کێن، وتی: (( ناوم خاڵخاڵە. چی؟ ڕێوی؟ خوای گەورە ڕێگەم وێڵ کردوە. سێ ڕۆژو سێ شەوە بە دەوری کونێك دا دەخولێمەوە بەبێ ئەوەی بزانم لە کوێم. ))

خاڵخاڵ، کونی بنمیچەکەی گەورەتر کردو خۆی هەڵدایە خوارەوە و لە تەنیشتی مام ڕێوییەوە خۆی گرتەوە دوا بەدوای ئەویش گیانەوەرێکی بچکۆلانەی تر کە کوڕی خاڵخاڵ بو خۆی فڕێدایە خاورەوە.

خاڵخاڵ بە جۆشەوە پرسی: (( دەزانی هەواڵی سەرەوە چیە؟ گەرەلاوژییەکی بێ سەروبەر بەرپا بوە. پتر لە نیوەی دارستانەکە وێران کراوە، چەکدارەکان هەمو لایەکیان تەنیوە. تەنانەت بە شەویش ناتوانین لە لانەکانمان بچینە دەرەوە، برسێتی و تینوێتی خەریکە هەمووومان لەناو دەبات . ))

مام ڕێوی پرسی: (( ئێمە! مەبەستت لە ئێمە چیە؟.))

خاڵخاڵ وتی: (( هەمو ئەو گیانەوەرانەی لەم ناوچەیەدا دەژین؛ من، مشکە کوێرە و کەروێشك و ژن و منداڵەکانمان تەنانەت مشکی خورماش کە دەتوانێ بە نهێنی بۆ هەمو شوێنێك بڕوات، ئێستا خۆی و ژن و هەر شەش منداڵەکەی لە لانەکەی من خۆیان شاردۆتەوە. دەتوانین بۆچ لایەك بچین؟ ها؟ پێم بڵێ جەنابی مام ڕێوی! لەو باوەڕەدام بەم نزیکانە هەمومان لەناو دەچین. ))

مام ڕێوی سەرنجی هەرسێ بێچوەکەیدا و پێکەنینێکی بۆ کردن. بێچوەکانیش بە پێکەنین وەڵامیان دایەوە. پێکەنینێکی بە مانای ئەوتۆ کە ڕازێکی شاراوەی تیا بەدیدەکرا.

مام ڕێوی وتی: (( خاڵخاڵی ئازیز و بەڕێز، قسەکانی تۆ ئەو مانایە دەبەخشێ کە هەموی خەتای منە. ))

خاڵخاڵ بە تووڕەییەوە وتی: (( بەڵی، خەتای تۆیە، دڵنیام لەوەی ئەو خاوەن کێڵگە نەفرەتیانە تا نەتگرن لێرە ناڕۆن. دڵگرانم! چونکە ئەو گیانەوەرانەی لەم ناوچەیەدا دەژین بەبێ تاوان لەناو دەچن. ))

خاڵخاڵ دانیشت. لە کاتێکدا هەر دوقاچی بە چوار دەوری بێچوەکەیدا گرێدا بو لەسەرخۆ وتی:

(( هەمو لەناو دەچین، ژنە کلۆڵەکەشم لەبەر لاوازی و برسێتی ناتوانێت یەك بست زەوی هەڵکۆڵێت ))

مـام ڕێـوی بـەدەم پێکەنینـەوە وتـی:(( نارەحـەت مەبـە، خێزانەکـەم خـەریکی ئامادەکردنی داوەتێکی گەورەیە، داوەتی گۆشتی مریشکی قەڵەو! ))
خاڵخاڵ بەدەم ناڵەوە وتـی: (( بێدەنـگ بـە! پێویست ناکات گاڵتـەم پێبکـەیت. لەمە زیاتر بەرگە ناگرم. ))
یەکێك لە بێچوەکان وتـی: (( باوکم راست دەکات.. گاڵتـەت پێناکات. مریشکی زۆرمان هەیە.
مام ڕێوی درێژەی بە قسەکانی دا: ئێستا بە قسەی ئێوەبێ هەمو شتێك خەتای منە، کەواتە منیش داوەتان دەکەم. تۆ، مشکە کوێرە، کەروێشك، مشکی خورما و ژن و منداڵەکانتان، بە گوێرەی پێویست خواردنمان هەیە بەڵێنتان پێدەدەم کە بە برسێتی نەمێننەوە. ))
گۆڕ هەڵکەنە پرتەو بۆڵەیەکی کرد: (( راست دەکەیت؟! توخوا راست دەکەیت؟
مام ڕێوی دەستی بۆ لوتی خاڵخاڵ بردو، وتـی: (( بۆنـی بکـە! دەزانـی ئێمـە لـە کوێ بوین؟ ))
خاڵخاڵ پرسی : (( لە کوێ بون؟ ))
مام ڕێوی وتی: (( رێك لەناو کولانەی ژمارە یەکی مامران. ))
خاڵخاڵ بە سەرسوڕمانەوە، وی‌ت: (( نا؟! ))
مام ڕێوی لەسـەر قسـەکانی بـەردەوام بـو: (( بـەڵی. بـەڵام ئێسـتا لـە کوێـین و دەمانـەوێ بۆ کـوێ برۆیـن، ئـەوەیان پـەیوەندی بـە تـۆوە نیـە، تەنها لـە دوای ئێمەوە وەرە، بەراستی! تۆ دەتوانی لە هەڵکۆڵین دا یارمەتیمان بدەیت. خاڵخاڵە خنجیلانەکـەش بـا بگەڕێتـەوە بـۆلای دایکـی و ئـەو مـوژدە خۆشـەی پـێ ڕابگەیەنێ))
مام ڕێوی دوای ئەم قسانەی رویکردە خاڵخاڵە خنجیلانەکەو ، وتـی: (( پێیـان بڵێ کە مام ڕێوی داوەتێکی گەورەی بۆ کردون، ئنجا هەمویان بهێنە بۆ ئێرە و لێرەشەوە ئەم ڕێگەیە بگرنە بەر تا دەگەنە شوێنی داوەتەکە.))

خاڵخاڵە خنجیلانەکە وتی: (( بەڵێ، مام ڕێوی ! بەڵێ گەورەم ! راست دەفەرموی گەورەم ! سوپاست دەکەم ! ))
زۆر بە پەلەو بە خێرایی سەرکەوتە سەرێ و خۆیکرد بە کونی بنمیچەکەداو لە چاو تروکانیکدا دیار نەما.

## ١٣- هەمبارە گەورەکەی قازیان:

خاڵخاڵ رویدەمی کردە مام ڕێوی و لێی پرسی: (( ڕێوی ئازیز، بۆچی کلکت قرتاوە؟ ))
مام ڕێوی وتی: (( خاڵخاڵ، تکایە سەبارەت بەم مەسەلەیە قسەم لەگەڵدا مەکە، چونکە ئەم مەسەلەیە زۆر بێزارم دەکات. ))
بە بێدەنگی خەریکی لێدانی تونێلێکی نوێ بون، لە راستیدا خاڵخاڵ لە هەڵکۆڵین دا وەستایەکی زرنگ و لێهاتوبو. خاڵخاڵ لە ئیش کردن دا وادەهاتە بەرچاو لە جیاتی چوار دەستوپێ، سەدان دەست و پێی هەبێ، تونێلەکەش بە خێرایی بۆپێشەوە دەڕۆیشت.
زۆری نەخایاند گەیتشنە ژێر تەختە دارەکان. مام ڕێوی لەو کاتەی پێدەکەنی و دانە سپییەکانی جیر دەکردەوە، وتی: (( خاڵخاڵی ئازیز، ئەگەر هەڵەم نەکردبێ ئێستا لە ژێر کێڵگەکەی قازیانی چروکین.
لە راستیدا لە باشترین شوێنی کێڵگەکەیدا سەقامگیر بوین. ))
بێچوە ڕێوییەکە ورتەیەکی کرد: (( قازو مراوی! ))

دوا بە دوای ئەوەش هەردەمی دەلستەوە و، ورتەی دەهات ! (( گۆشتاوی بەتامی قازو مراوی ! قازی گەورەو قەڵەو ! ))
مام ڕێوی وتی : (( زۆر ڕاستە ! ))
خاڵخاڵ پرسی: (( لە ژێر ئەم زەمینەدا چۆن بزانین ئێرە کوێیە؟ ))
مام ڕێوی بەردەوام دانی جیر دەکردەوە، وتی: (( هەمو شوێنێکی ئەم سێ کێڵگەیە، وەك ناولەپی دەستم شارەزام، بۆ من زۆر ئاسانە لێرەوە شتەکانی سەر زەمین بدۆزمەوە. ))
مام ڕێوی سەرکەوتە سەرەوە و تەختەیەکی هەڵدایەوە، دوای ئەوەی تەختەیەکی تریشی هەڵدایەوە و سەری لە نێوان کونی تەختەکانەوە بردە ژوورەوە، ئنجا هەمو لەشی بردە ژورەوەو هاواری کرد: (( بەڵی، تەواوهاتوین، ئافەرین بۆ خۆم و لوتم، ئافەرین بۆ چاوەتیژەکانم! وەرن، تەماشاکەن. ))
خاڵخاڵ و سێ بێچوە ڕێوییەکە بەریز چونە ژورەوەو بەبینینی ئەو دیمەنە وڕو کاس بون و توانای قسەکردنیان نەما. ئەو دیمەنەی پێش چاویان لە خەو، و خەیاڵی ڕێوییەك دەچو.. نا .. چەشنی بەهەشتێك بو بۆ گیانەوەرە برسییەکان.
مام ڕێوی رویکردە خاڵخاڵ و ، وتی: (( خۆشەویستەکەم، کاکە خاڵخاڵ؛ ئەمە هەمبارە گەورەکەی قازیانە، ئەم شتە بەتام و بۆیانە دوای ئەوەی لە کێڵگەکەی ئامادە دەکرێن، دەهێنرێنە ئێرەو لێرەشەوە رەوانەی بازار دەکرێن. ))
ئەم هەمبارەش لە کولانەی مریشکەکانی مامران دەچوو. بریتی بو لە حەوشەیەکی گەورە کە چواردەوری بە دیواری تۆکمە هەڵچنرابو. سەرتاپای دیوارەکان پڕ بوون لە جۆرە رکێك ( قەفەس ) کە بڵندیان دەگەیشتە بنمیچەکە. ئەو رکانە پڕ بوون لە قەڵەوترین ، و چاکترین و گەورەترین قازو مراوی پاککراو و ئامادەکراو.
بەکاریتەی هەمبارەکەشەوە نزیکەی سەدپارچە گۆشتی دوکەلاوی و پەنجا پارچە گۆشتی سوێر کراو هەڵواسرابون. مام ڕێوی لە خۆشیان بەدەم سەماکردنەوە وتی: (( لەم دونیایەدا کەس ئەوەندەی ئێوە بەختەوەر نیە. ئەو شتانەی بەردەمتان دەبینن چەندە دڵگیر و جوان و نایابن؟ ))

دوای چەند ساتێك خاڵخاڵ و هەرسێ بێچوە ڕێوی‌یەکە بەبێ خواستی خۆیان بەرەو خواردنەکە ڕۆیشتن و پەلاماری خواردنەکەیان دا.
مام ڕێوی فەرمانی دا: (( ئارام بگرن. ئەمە داوەتی منە لەبەرئەوە من هەڵیاندەبژێرم. ))
لەو کاتەی هەمو دەمیان دەلستەوەبۆ دواوە گەرانەوە. مام ڕێویش لەسەرخۆ کەوتە سەرنج لێدان و تاقیکردنەوەی خواردنەکان.
مام ڕێوی لیکەکەی دەمی قووتدایەوە کە وەکو تاڵە دەزویەکی سپی شۆڕەوە بوبو. ئنجا وتی، پێویست ناکات ژمارەیەکی زۆر ببەین. نابێ کارێکی ئەوتۆ بکەین کە پێمان بزانن.. تەنها چەند دانەیەکی باش هەڵدەبژێرین. لەبەر ئەوە سەرەتا بە چوار مراوی قەڵەو دەست پێدەکەم. ))
مام ڕێوی دوای ئەم قسانەی چوار مراوی گەورەو قەڵەوی جیاکردەوەو وتی: (( زۆر حەزیان لێ دەکەن. هەقە قازیان لەبەرخاتری ئەم کارەی لەبەردەم خەڵکی‌دا خەلاتی تایبەتی بکرێ.. زۆر چاکە خاڵخاڵ. یارمەتیم بدە تا بییانهێنمە خوارەوە. ڕۆڵەکانم.. ئێوەش یارمەتیمان بدەن. لێرەوە .. خوای گەورە. بۆچی ئاو بە دەمتانەوە ناوەستێ؟ پێم خراپ نیە ئەگەر چەند قازێکیش لەگەڵ خۆماندا ببەین، سێ قاز بەسە، هەرە گەورەکەیان دەبەین.. خوای گەورە .. خوای گەورە.. ئێوە تا ئێستا لەم جۆرە قازانەتان بینیوە؟ لە ڕاستی‌دا ئێرە لە چێشتخانەی گەورە پیاوان دەچێت.. ئاگاداربن.. بە هێمنی! .. لێرەوە. چ دەڵێن بۆ دوپارچە گۆشتی دوکەلاوی؟.. خاڵخاڵ دەزانی من بریارمدا ئەو گۆشتنانە دوکەڵ بدەن.. بەئەرك نەبێ یارمەتیم بدەن تا بەم پەیژەیەدا سەربکەوم. ))
خاڵخاڵ بۆڵەیەکی کرد : (( بیر لە گۆشتە سوێر کراوەکان دەکەمەوە.. )) ئنجا لە خۆشیان کەوتە سەماکردن و وتی: (( با پارچە گۆشتێکی سوێر کراویش بەرین. ئەو دانەیان دەڵێم .. گەورەکەیان.. ئەوی سەروتر.. ))
هەر لەوکاتەشدا بێچوە هەرە خنجیلانەکە وتی: (( کەمێك گێزەریش.. پێویستە کەمێك گێزەریش لە گەڵ خۆمان دا بەرین..))
مام ڕێوی وتی: (( ڕۆڵە گیان، کاتی وازیکردن نیە، ئێمە کەی گێزەر خۆرین. ))

بێچوەکە درێژەی بە قسەکانی دا: (( خۆمان نامانەوێت، بۆ کەروێشکەکان، .. چونکە کەروێشك گۆشت ناخوات.. ئەوان حەز بە سەوزی و گێزەر دەکەن.. ))
مام ڕێوی وتی: (( ڕاست دەکەیت، خنجیلانەکەم، تۆ زۆر زیرەك و ژیری، دە چەپکی گێزەریش هەڵگرن. ))
خێرا ئەم خواردنە بەتام و بۆیانە لە ناوەراستی هەمبارەکە بڵاوبونەوە، بێچوە ڕێوییەکان خۆیان دانەواندبووەو سەیری خواردنەکەیان دەکرد. تروسکەیەکی ئەستێرە ئاسا لە چاوانیان دەدرەوشایەوە.
مام ڕێوی وتی: (( ئێستا دەبێ لە هاوڕێی خۆشەویستمان کاکە قازیان دوعارەبانەی دەستی بچوکیش قەرز بکەین. ))
مام ڕێوی و خاڵخاڵ لە سوچێکی هەمبارەکەدا دو عارەبانەی دەستیان هەڵگرت و قاز، مراوی، گۆشتی دوکەڵاوی، گۆشتی سوێر کراو و گێزەرەکەیان خستە سەر عارەبانەکان و بەپەلە بردیان بۆ تونێلەکە ئنجا هەمویان گەڕانەوە بۆ تونێلەکە بۆ ئەوەی کەس هەستیان پێنەکات. مام ڕێوی زۆر وەستایانە تەختەکانی هەمبارەکەی ڕێك وەکو جاران دانایەوە.
مام ڕێوی ڕوی کردە دوان لە بێچوەکانی و، وتی: (( ڕۆڵەکانم، هەریەکەتان عارەبانەیەك لێخوڕێ و بەزوترین کات ئەم خواردنە بگەیەننە دایکتان. کە دایکتان بینی سەلامی منی پێ بگەیەنن و پێی بڵێن خواردنێکی زۆر ئامادە بکات چونکە ئەمڕۆ میوانمان هەیە هەروەها پێی بڵێن کارێکی بچوکمان ماوە ئەویش تەواو دەکەین و دەست بەجێ دەگەڕێینەوە. ))
دو بێچوەکە وەڵاکیان دایەوە: (( بە چاوان باوکە! گشتیان بە ئەنجام دەگەیەنین.))
پاشان هەریەکێك لە بێچوە ڕێوییەکان کەوتە لێخوڕینی عارەبانەیەکی دەستی و بە شادمانییەوە گەڕانەوە بۆ لای دایکیان.

### ١٤- خاڵخاڵ گومانی هەیە:

مام ڕێوی وتی:
(( ئێستا تەنها شوێنێکمان ماوە پێویستە بۆ ئەو شوێنەش بڕۆین. ))
بێچوە بچکۆلانەکە، کە بە تەنها لەلای باوکی مابووە وتی: (( گرەو دەکەم، دەزانم بۆ کوێ دەڕۆین. ))
خاڵخاڵ وتی: (( بۆ کوێ؟ ))
بێچوە خنجیلانەکە وتی: (( تا ئێستا بۆ دوو شوێن ڕۆیشتوین؛ کولانەی مریشکەکانی مامران و هەمبارەکەی قازیان بەڵام هێشتا بۆ باخەکەی سێوان نەڕۆیشتوین کەواتە دەبێ بۆ باخەکەی سێوانیش بڕۆین. ))
مام ڕێوی وتی: (( ئافەرین، راست دەکەیت، بەڵام دەزانن بۆ کام بەشی باخەکەی سێوان دەڕۆین. ))
خاڵخاڵ و بێچوەکە بەسەر سوڕمانەوە پرسیان: ( نا، بۆ کام بەشیان؟ ))
مام ڕێوی وتی: (( پێتان نالێم، دەبێ چاوەڕوان بن تا بە چاوی خۆتان ببینن.))
هەر بەدەم قسەکردنەوە دەستیان کرد بە هەڵکۆڵین و تونێلەکەش زیاتر بۆ پێشەوە دەڕۆیشت.
لەناکاو خاڵخاڵ دەستی لەکار هەڵگرت و، وتی: (( ئایا بەم کارەت نارەحەت نابی؟. ))
مام ڕێوی وتی: (( نارەحەت؟! هیچ شتێك نابێتە هۆی نارەحەتیم؟!. ))
خاڵخاڵ وتی: (( ئەمە دزییە. ))

مام ڕێوی دەستی لەکار هەڵگرت و سەرنجێکی گاڵتە جارییانەی خاڵخاڵی دا، ئنجا وتی: (( خاڵخاڵی ئازیزی بێمێشك! لەم دونیایەدا کەسێك هەیە کە برسێتی هەرەشەی مردن لە خۆی و منداڵەکانی بکات و چەند مریشکێکیان بۆ ڕاو نەکات؟ ئەویش لە کێ؟ لە خەڵکانێکی وەکو مامران، قازیان و سێوان..))

خاڵخاڵ هەوڵیدا بە شێوەیەکی قوڵتر بیر لەمەسەلەکە بکاتەوە. لەو ماوە کورتەی ئەو خەریکی بیرکردنەوە بو، بێدەنگی باڵی بەسەر هەمو لایەکدا کێشا.

پاشان وتی: (( بە درێژای تەمەنم شایانی ڕێز بووم. ))

مام ڕێوی وتی: (( تەماشاکە! مامران و قازیان و سێوان لە دەرەوەی تونێلەکە چاوەڕوانن تا لە دەرفەتێکدا بمانکوژن. ئایا لە مەتێدەگەیت؟ هیوادارم لێی تێبگەیت. ))

خاڵخاڵ واخۆی دەنواند کە گیانەوەرێکی زۆر بەڕێزە، وتی: (( تێدەگەم، مام ڕێوی ئازیز. لە ڕاستی دا تێدەگەم))

مام ڕێوی لەسەر قسەکانی بەردەوام بو:(( بەڵام ئێمە وەکو ئەوان نین، هەرگیز مەبەستمان نیە بیانکوژین.))

خاڵخاڵ ژیرانە وتی: (( هیوادارم بەو جۆرە بێت. ))

مام ڕێوی وتی: (( تەنانەت بیریشی لێناکەمەوە. زۆر بە سادەیی برێك خواردن دەبەین تا خۆمان و خێزانەکانمان لە مردن ڕزگار بکەین، وانیە؟ ))

خاڵخاڵ بەتەواوی مێشکی لەکار کەوتبو، وتی: (( دڵنیام کە دەبێ هەر بەو جۆرە بێت. ))

مام ڕێوی وتی: (( ئەگەر دەیانەوێت ئازارمان بدەن وازیان لێ بهێنن با ئازارمان بدەن، بەڵام ئێمە لەم ژێر زەمینەشدا ئاشتی خوازێکی چاکین. ))

خاڵخاڵ بە ڕوویەکی گەشەوە سەری بۆلای مام ڕێوی وەرچەرخاندو، وتی:(( مام ڕێوی خۆشم دەوێیت. ))

مام ڕێوی وتی: (( سوپاست دەکەم. وەرە با دەست بە ئیشەکەمان بکەینەوە. ))

دوای پێنج دەقیقە کارکردن گەیشتنە جێگەیەکی سفت و سۆڵ کە بەڕواڵەت وا دیار بوو بڕینی ئەستەم بێت. خاڵخاڵ وتی: (( وای! ئەمە چیە؟ لە دیواری بەرد دەچێت . ))

گیانەوەرەکان دوبارە پەنجەیان بەو جێگە ڕەقەدا هێنا. بەڵێ، دیوارە بەڵام دیوارەکە لە خشت دروست کراوە نەك لە بەرد. دیوارەکە ڕێك لەلای راستەوە بەرامبەریان کەوتبو بۆیە ڕێگەکەی لێگرتبون.

خاڵخاڵ وتی: (( تا ئێستا کەسم نەدیوە لە ژێر زەویدا دیوار دروست بکات. ))

مام ڕێوی وتی: (( زۆر سادەیە. ئەمە دیواری ژێرخانەکەیە، ئەگەر هەڵەم نەکردبێ ئێرە ئەو شوێنەیە کە بە دوایدا دەگەڕام. ))

مام ڕێوی زۆر بە وریایی دیوارەکەی تاقیکردەوە و لە شوێنێکی دیوارەکە خشتێکی لەقی دۆزییەوە، بە ئاسانی خشتەکەی دەرهێنا. کونێکی بچوك لە دیوارەکە دروست بو. لە پڕ لە کونەکەوە سەری گیانەوەرێکی سمێڵ درێژ دەرکەوت و هاواری کرد: (( بڕۆن! لێرە بڕۆن! مافی ئەوەتان نیە بێنە ئێرە، ئەمەماڵی منە ! ))

خاڵخاڵ وتی: (( خوایە گیان ! ئەمە مشکی بیابانە! ))

مام ڕێوی هاواری کرد: (( ئەیگیانەوەری بێشەرم! هەر دەمزانی درەنگ بێ یا زوو، لێرە یا لەوێ چقڵێکمان بۆ پەیدا دەبێت. ))

مشکی بیابان پڕ بە دەمی قیراندی: (( لێرە بڕۆن، ئەمە ماڵی منە. ))

مام ڕێوی هاواری کرد: (( بێدەنگ بە! ))

مشکەکە دیسانەوە قیراندی: (( بێدەنگ نابم، ئەمە ماڵی منە، لە پێش ئێوە هاتومەتە ئێرە ))

مام ڕێوی پێکەنی و دانە تیژە سپییەکانی بۆ دەرخست و بە میهرەبانییەوە وتی: (( ئازیزەکەم، من برسیمە ئەگەر یارمەتیم نەدەیت ناچار دەبم خۆت بخۆم.))

مام ڕێوی دوای ئەم قسانەی چووە بەردەم کونەکە. مشکەکە لە ترسان پاشەو پاش گەڕایەوە.

مام ڕێوی دیسانەوە دەستی بە پێکەنین کردەوەو چەند خشتێکی لەقی لابرد.
کاتێك بە گوێرەی پێویست ڕێگەیان کردەوە، مام ڕێوی، خاڵخاڵ و بێچوەکەی چونە ژێرخانەکەوە. ژێر خانێکی گەورەو شێدار.
مام ڕێوی وتی: (( ئەمەش ژێرخانەکەی سێوان! ))
خاڵخاڵ وتی: (( ژێرخان؟! ئێرە چۆڵە. ))
بێچوەکەی لەو کاتەدا بە تاریکییەکە سەرسام بو، وتی: (( ئەی قەلەکان لە کوێن؟ لەو باوەڕەدابوم سێوان لە باخەکەی قەل بەخێو دەکات. ))
مام ڕێوی وتی:((بەڵێ، قەل بەخێودەکات بەلام ئێستا به دوای قەلدا ناگەڕێین، بەشی خۆمان گۆشتمان هەیە )).
بێچوەکە پرسی: ( ئەی بە دوای چ دەگەڕێین؟ ))
مام ڕێوی وتی: (( جارێکی تر بە جوانی چاو بە چواردەوری خۆتاندا بگێڕن! بزانن جگە لە قەل شتێکی تر نابینن کە سەرنجتان رابکێشێ. ))
خاڵخاڵ و بێچوە ڕێوی‌یەکە سەرنجی تاریکییەکاندا. هەر بە تاریکییەکە راهاتن، سەدان شوشەی گەورەو بچوکیان بینی کە پڕبون لە شەربەت، مورەبا و شەربەتی سێو کە بە چواردەوری ژێر خانەکەدا هەڵچنرابون بێچوەکە کەوتە هەڵبەزو دابەز، وتی: (( باوکە، تەماشاکە چ دەبینم؟ شەربەتی شیرینی بەتام بۆ منالان! ))
مام ڕێوی وتی: (( بەڵێ، وایە! ))
خاڵخاڵ هاواری کرد: (( سەیرە ))
مام ڕێوی وتی: (( ژێرخانە شاراوەکەی سێوان! بەلام بەوریایی و بە بێدەنگی هەڵسوکەت بکەن چونکە ئەم ژێرخانە دەکەوێتە ژێر هۆدەکانیانەوە. ))
خاڵخاڵ وتی: (( شەربەت و مورەبا بۆ ئێمە زۆر بە کەڵکن، ڕۆژانە لەگەڵ هەرژەمێکدا دەتوانین کەمێك شەربەت و شیرینی بخۆین. ))

له هەمان کاتدا گوێیان لە دەنگی ژنێك بو کە لە دەرەوەی ژێرخانەکە قسەی دەکرد.

- بە پەلە برۆ برێك شەربەتی سێو بهێنە. خۆت دەزانی سێوان بەگ حەزبە چاوەڕوانی ناکات. بە تایبەتی ئەو شەوانەی کە لە ژێر خێوەت دا بێت.

مام ڕێوی، خاڵخاڵ و بێچوە ڕێوییەکە هەر کە گوێیان لەو قسانە بو لە شوێنی خۆیان وشك بون و بۆ ساتێك جوڵەیان نەکرد. گوێچکەیان هەڵخستبو، هەمو ئەندامی لەشیان وەك شۆرەبی دەلەرزی. پاش کەمێك دەنگی کردنەوەی دەرگاکەیان بیست. دەرگاکە بە بنمیچی ژێرخانەکەوە بو بە چەند پلیکانەیەکی بەرد گریدرابو بە ناو ژێرخانەکەوە.

ئێستاش یەکێك خەریکە دێتە خوارەوە.

## ١٥- ژن:

مام ڕێوی وتی: (( خێراکەن، خۆتان بشارنەوە! ))

مام ڕێوی و خاڵخاڵ بازیاندایە سەر قاتێك و لە پشتی چەند شوشەیەکی شەربەتی سێو خۆیان مت گرد. مام ڕێوی لە پشتی شوشەکانەوە ژنێکی زۆر قەڵەوی بینی بە پلیکانەکاندا دەهاتە خوارەوە.

لە داوپلەدا، ژنەکە هەڵوێستەیەکی کردو تەماشایەکی راست و چەپی خۆی کرد، ئنجا بەرەو ئەو شوێنە

بەرامبەریان وەستا، هێندە لێیان نزیك كەوتەوەكە تەنها قەوارەی شوشەكان لە نێوانیان دا مایەوە بەڵام ژنەكە هەستی بە هیچ نەكرد. مام ڕێوی تەنانەت دەیتوانی دەنگی هەناسەی ژنەكە ببیستیو بیشیان ژمێرێت. ژنەكە لەو كاتەی دەستی لەسەر یەكێك لە شوشەكان دانابو. هاواری كرد: (( سێوان بەگ، چەند شوشەی شەربەتی دەوێ؟. ))

- دەنگێك لە دەرەوەی ژێرخانەكە وەڵامی دایەوە.
- دو یا سێ شوشە بەسە.

ژنەكە دوبارە هاواری كردەوە: (( بەڵام خاتو سێوان، دوێنێ سێوان بەگ چوار شوشەی خواردەوە.

دەنگەكە وەڵامی دایەوە.

بەڵێ؛ بەڵام ئەمڕۆ زۆری ناوێت چونكە لە چەند سەعاتێك زیاتر نامێنێتەوە. سێوان بەگ دەیوت ئەمڕۆ مام ڕێوی بە ناچاری دێتە دەرەوە. ئەستەمە بتوانێت ڕۆژێكی تر بەرگەی بریسێتی بگریو بە زوندویتی بمێنێتەوە.

ژنەكە ئەو شوشەیەی كە دەستیلەسەر دانابو، لەسەرتاقەكە هەڵگرت و خستیە سەر زەوییەكە. ئنجا نۆرەی هەڵگرتنی شوشەكەی تەنیشتی بو، بەڵام شوشەی سێیەم ئەو شوشەیە بو كە مام ڕێوی لە پشتییەوە خۆی شاردبووە.

دەنگەكەی دەرەوە وتی:

- كاتێك ئاسودە دەبین كە ئەو گیانەوەرە نەفرەتیە بكوژین و كەوڵەكەشی لە پێش هەیوانی ماڵەوە هەڵواسین.
- خاتو سێوان؛ بیرم كەوتەوە سێوان بەگ بەڵێنی پێدام كە كلكە ڕێوییەكەم بە دیاری بداتێ.
- بۆچی نازانی كلكی لەت و پەت بوە؟
- مەبەستان ئەوەی كە مام ڕێوی كلكی نەماوە.
- بەڵێ؛ چونكە فیشەكەكان بەر كلكی كەوتون و مام ڕێویش رایكردووە.

ژنەكە وتی: (( بەڵام من كلكەكەیم دەویست. ))

دەنگەکە وەڵامی دایەوە: (( لە جیاتی کلکی، کەللەکەی بەرە. بەڵی، کەللەسەر لە کلك باشترە دەبێ لە پێشدا کەللەسەرەکەی بەتاڵ بکەیت ئنجا پری بکەیت لە پارچە پەڕۆ یا کا پاشان بە دیواری ژوری نوستنەکەتەوە هەڵیواسە. ئێستا خێراکە و شەربەتەکان بهێنە. ))

ژنەکە لەو کاتەی شوشەی دوەمی لەسەر تاقەکە هەڵدەگرت وتی: (( بە چاوان، وا هاتم. ))

مام ڕێوی لەبەرخۆیەوە وتی: (( ئەگەر شوشەیەکی تر هەڵگرێت، دەمان بینێت. ))

لەهەمان کاتدا مام ڕێوی هەستی کرد کە بێچوەکەی لە ترسان توند خۆی پێوە نوساندوە و دەشلەرزێ.

ژنەکە وتی: (( خاتو سێوان، سێ دانە بهێنم یا دو دانە، بەسە؟ ))

دەنگەکە وتی: (( خوایە گیان، بەدەست تەمەڵی تۆوە ماندو بوم ، دە خێراکە!))

ژنەکە لەبەرخۆیەوە وتی: (( کەواتە دو دانە بەسە. دەبێ پەلە بکەم. بەهەرحاڵ ئەمڕۆ بێ یا سبەینێ سێوان بەگ هەر هەمویان دەخواتەوە. ))

ژنەکە شوشەیەکی گرت بە دەستییەوە شوشەکەی تری خستە ناو سەبەتەکەیەوە. سەبەتەکەشی نایە سەرشانیو گەڕایەوە .

کاتێك ژنەکە پێی خستە سەر یەکەم پلیکانە هەڵوێستەیەکی کردو بە چوار دەوری خۆیدا کەوتە بۆن کردن و چاوگێڕان. ئنجا وتی: (( خاتو سێوان دیسانەوە مشکە بیابانییەکان هاتونەتەوە. بە بۆن هەستیان پێدەکەم. ))

دەنگەکە وتی:

- پێویستە دەرمان خواردیان

بکەیت، دەبێ ژەهریان بۆ دابنێیێ. تێگەیشتی؟ ژەهر! دەزانی لە کوێن؟

ژنەکە وتی: (( بەڵێ خاتون، دەزانم .. ))

ئنجا بە پلیکانەکان دا سەرکەوتە سەرەوە و لە ژێرخانەکەش چوە دەرەوە و دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە داخست.

مام ڕێوی وتی: (( خێرا، یەکی شوشەیەك هەڵگرن و بڕۆین. ))

مشکە بیابانییەکە لەسەر تاقێك وەستابو، وتی: (( چیم پێ وتن؟ خەریك بو بکەونە داوەوە. خێرا لێرە بڕۆن، حەزناکەم لێرە بمێننەوە، چونکە ئەمەماڵی منە! ))

مام ڕێوی وتی: (( حەز دەکەیت لێرە بمێنیتەوە دەرمان خوارد بکرێی؟ ))

مشکەکە وتی: (( نەیخۆن تاڵە، دەرمان خوارد بکرێم؟ هەرگیز ناتوانن دەرمان خواردم بکەن چونکە لە کاتی ژەهر رشتن دا لەسەرەوە دادەنیشم و تەماشایان دەکەم. ))

مام ڕێوی و خاڵخاڵ و بێچوە ڕێوییەکە یەکی شوشەیەك شەربەتیان هەڵگرتبو، بە پەلە لە کوێوە هاتبون هەر لەوێشەوە گەڕانەوە.

پێش ئەوەی بڕۆن مام ڕێوی وتی: (( خواحافیز مشکی بیابانی! سوپاست دەکەم بۆ شەربەتە شیرین و بەتامەکەت. ))

مشکەکە قیراندی: (( ئێوە دزن! تالانکەرن! ڕێگرن! ))

## ١٦- *داوەتێکی گەورە:*

لەناو تونێلەکەدا هەمو ڕاوەستان تاکو مام ڕێوی دیوارەکە چاك بکاتەوە، مام ڕێوی دەستبەجێ و زۆر وەستایانە خشتەکانی لە شوێنی خۆی دانایەوە.

پاشان وتی: (( شەربەتێکی چاکە! هەست بە شیرینییەکەیان دەکەم، بەڵام خۆ هەمو خۆمانەین بەراستی ئەم مشکە بیابانییەش زۆر بێگوێیە. ))

خاڵخاڵ وتی: (( بێگوێو بێ ڕەوشت! هەمو مشکە بیابانییەکان بێ ڕەشتن، تا ئێستا مشکێکی بیابانی بەرەوشتم نەدیوە. ))

مام ڕێوی وتی: (( کارمان تەواوبو. با بەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە چونکە داوەتەکە هەر ئێمەی کەمە. ))

هەمو بە خۆیان و شوشە شەربەتەکانیانەوە کەوتنە ڕێ ! مام ڕێوی لە پێشەوە دەڕۆیشت و بێچوە خنجیلانەکەش لە پشتی باوکییەوە و خاڵخاڵیش لە دواوە زۆر بە خێرایی دەڕۆیشتن. لەی ماوەیەکی کورتدا هەمبارە گەورەکەی قازیان و کولانە مریشکی ژمارەیەکی مامرانیان بڕی. لەو کاتەدا مام ڕێوی وتی:
(( خۆشەویستەکانم، شوشەکان بەرز ڕابگرن تا نەشکێن. هەر ئێستا دەگەینە لایان. بیرلە چاوەڕوانیان بکەنەوە. بیر لەو دیارییە بکەنەوە کە بۆیانی دەبەین.
بەڵێ، شوشەی پڕ لە شەربەت، میوانەکان هەر بە بینینی شەربەتەکان هەست بە شیرینییەکەی دەکەن.))
مام ڕێوی هەر بەو جۆرەی کە لە پێشەوە دەڕۆیشت دەستی کرد بە گۆرانی وتن {لەسەرخۆو بە هێمنی بەرەو ماڵەوە باڵدەگرم.. دەچمە لای هاوسەرە خۆشەویستەکەم .. بەڵام تا لە دونیادا بمێنم .. نابێت هەست بە کڵۆڵی بکات }.
ئنجا خاڵخاڵ دەستی کرد بە گۆرانی وتن: {خانمەکەم.. تۆ برسی بوی.. لەسەرە مەرگدا بوی.. بەڵام تا لە دونیادا بمێنم.. نابێت هەست بە کڵۆڵی بکات}.
هێشتا هەر گۆرانیان دەوت تونێلەکە کۆتایی پێهات، بە گەیشتنیان روبەروی دەیمەنێکی ئەوتۆ بونەوە کە بە درێژایی تەمەنیان دیمەنی لەو بابەتەیان نەدیبو، داوەتەکە تازە دەستی پێکردبوو، لەناو تونێلەکە ژورێکی گەورەی نانخواردن ئامادەکرابو، لە ناوەڕاستی ژورەکەدا بیست و نۆ ( ٢٩ ) گیانەوەر لە دەوری مێزێکی گەورە دانیشتبون.. خێزانی مام ڕێوی و سێ بێچو، خێزانی خاڵخاڵ و سێبێچو، مشکە کوێرەو خێزانەکەی و چوار بێچو، کەروێشک و

خێزانەکەی پێنج بێچو، مشکی خورما و خێزانەکەی و شەش بێچوا سەر مێزەکە پڕ بو لە مریشك، مراوی، قاز، گۆشتی دوکەڵاوی و گۆشتی سوێرکراو..
خێزانەکەی مام ڕێوی هەر کە مام ڕێوی و خاڵخاڵ و بێچوەکەی بینی، وتی:
(( لێمببورن، لەمە زیاتر ناتوانین خۆمان بگرین. ))
دیارە دەبێ ئەوەتان لەیاد مابێ کەچەند ڕۆژێك بو هیچمان نەخواردبو بۆیە زۆر برسیان بو لەبەرئەوە بە بێدەنگی کەوتنە گیانی خواردنەکە. تاکە شتێك کە دەبیسترا دەنگی تەقەی دان وخرمەو قوت دانی خواردنەکەبو. دوای نانخواردن، خاڵخاڵ هەستایە سەرپێ و، وتی: (( ڕێگەم پێبدەن تا زۆر سوپاسی مام ڕێوی بکەم، ، چونکە ئەمڕۆ ئەو گیانی هەمومانی لەمردن ڕزگار کرد. ))
هەمو پێکەوە هاواریان کرد :((بەڵی، ئێمەش سوپاسی دەکەین، بژی مام ڕێوی! خوا تەمەنی درێژ بکات.))
لە هەمان کاتیشدا خاتو ڕێوی بە شەرمەوە سەیری بەری پێی دەکرد ، وتی: (( من ناتوانم هیچ بڵێم تەنها ئەوە من نەبێت کە بەراستی مێردەکەم (( ڕێوییەکی سەرسوڕهێنەرە )).
هەمویان قسەکەی خاتو ڕێوییان پەسەند کرد و دەستیان کرد بە هۆرا کێشان، ڕێوییەکە لە ژێر لێوەوە وتی:
- خواردنێکی بەتامە..
پاشان هەستایە سەرپێ. هەموو بێدەنگ بون. مام ڕێوی درێژەی بە قسەکانی دا: (( هاوڕێیان! ئەم خواردنە بە چێژو بەتامە نیشانەی رەوشت بەرزی و لەخۆبوردویی مامران و قازیان و سێوانە..))
هەمو دوبارە دەستیان کردەوە بە هۆرا کێشان .
مام ڕێوی وتی: (( هیوادارم تێر سکی خۆتان نانتان خواردبێت. ))
هەمو کەوتنە هۆراکێشان. ئنجا مام ڕێوی بە ئاوازێکی جیدی وتی: (( دۆستانیخۆشەویست، وەرن با کەمێك بە جیدی بیر لە سبەینێ و دوسبەینێ و ڕۆژانی داهاتو بکەینەوە . خۆتان دەزانن هەریەکێك لە ئێمە بچێتە دەرەوە دەکوژرێت. وانیە؟!))

هەمو هاواریان کرد: (( بەڵێ وایە! مامران وتویەتی ئەگەر هێندەی نوکە دەرزییەکیشیان دەربکەوێت تەقەیان لێ دەکەم. ))
مام ڕێوی وتی: (( ڕاستە ، بەڵام کێ دەیەوێت بچێتە دەرەوە؟ مەگەر ئەوەی خوا سەری لێتێکدابێت، بەهەرحاڵ نابێت کەس بچێتە دەرەوە، ئێمەی گیانەوەران نەفرەت لە چونە دەرەوە دەکەین، دەرەوە پڕە لە دوژمن، جاران دەچوینەدەرەوە تا بژێوی خۆمان و مناڵەکانمان دابین بکەین، بەڵام ئازیزەکانم ئێستا هەلومەرج بە تەواوی گۆڕاوە ، تونێلێکی بێ وێنەمان هەیە کە بە سێ هەمباری گەورەی خواردنەوە گرێدراوە. ))
خاڵخاڵ قسەکەی بە مام ڕێوی بڕی و، وتی: (( ئوباڵ بە گردنم ڕاستە، بەم چاوانەی خۆم بینیومن. )
مام ڕێوی وتی: (( دەزانن ئەمە مانای چیە؟ مانای ئەوەیە کەسمان پێویستمان بە دەرەوەنیە. ))
بە بیستنی ئەم قسانەی مام ڕێوی لەناو ئەو گیانەوەرانەیکە لە چوار دەوری مێزەکە دانیشتبون ژاوەژاوێك بەرپا بو، مام ڕێوی درێژەی بە قسەکانی دا: (( بەردەوام بۆ ئێرە بانگهێشتان دەکەم. ))
هەمو هاواریان کرد : (( بەردەوام ))
کەروێشکەکە رویکردە خێزانەکەی و ، وتی: (( خوایە گیان، چەند دڵگیرە، تەنها بیری لێبکەرەوە تا ماوین ناکەوینە بەر ڕێژنەی گوللە. ))
مام ڕێوی وتی: (( بەڵێ، گوندێکی بچوك بە جادەو خانوبەرەوە دروست دەکەین، لەهەرلایەك خانویەکی تایبەتی بۆ خاڵخاڵ، مشکە کوێرە، کەروێشك، مشکی خورما و ماڵ و مناڵیان دروست دەکەین. منیش ڕۆژانە دەچمە فرۆشگە و شتومەکی پێویست دەکرم و هەمو ڕۆژێك وەکو ئەمڕۆ خواردن دەخۆین. ))
دوای بیستنی قسەکانی مام ڕێوی هەمو گیانەوەرەکان کەوتنە هۆراکێشان. هۆرایەکی ئەوتۆ کە دەگەیشتە گوێ.

### ١٧- تا ئێستاش چاوەڕوانن:

لەسەرەوەی کونەکە مامران، قازیان و سێوان لە دەرەوەی خێوەتەکانیان سازو ئامادە لەسەر کورسیدانیشتون و چەکەکانیشیان لەسەر ئەژنۆیان داناوە .
لەو کاتەشدا وردە وردە باران بەسەر هەرسێکیان دەبارێ و هەمو جلەکانیان تەر دەبێ
مامران دەڵێت: (( لەمەزیاتر ناتوانێ لە کونەکەدا بمێنێتەوە. ))
قازیان دەڵێت : (( برسێتی زۆری بۆ هێناوە . ))
سێوان: (( زۆر ڕاستە، چاوەڕوانی دەرفەتێکە تا رابکات. ئاگاداربن چەکەکانتان توند بە دەستەوە بگرن.))
ئەو خاوەن کێڵگانە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی مام ڕێوی دەکەن.
تا ئەوەندەی من بزانم، ئێستایش هەر چاوەڕوانن.

# لەزنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم

| | | |
|---|---|---|
| ١-پیکاسۆ/ لێکۆڵینەوە | ئینگو والتەر | و. لەسویدیەوە/ زۆراب |
| ٢-خوان/ دەق | ئەفلاتوون | و. لەعەرەبییەوە/ ئاوات ئەحمەد |
| ٣-مارا-ساد/ شانۆگەری | پیتەر ڤایس | و. لەئینگلیزییەوە/ شێرزاد حەسەن |
| ٤-دنیای شتە بچووکەکان/ وتار | رێبوار سیوەیلی | |
| ٥-جەژنی لەدایکبونی | ئەلیسۆن ئەتتلی | و. تۆفیق ئەحمەد عبدالله |
| کەروێشکە خرپن/ چیرۆك بۆ منداڵان | | |
| ٦-هێلانە/ رۆمان | حسێن عارف | |
| ٧-راپەرینی شیخ سەعیدی پیران/ مێژوو | رۆبەرت ئۆلسن | و. لە فارسییەوە/ ئەبوبەکر خۆشناو |
| ٨-هوشیاریی ئابووری / ئابوری | فوئاد تاهیر سادق | |
| ٩-بینای هونەری | ئەحلام مەنسور | |
| لە کورتە چیرۆکی کوردیدا/لێکۆڵینەوە | | |
| ١٠-کوردو کوردستان/ مێژوو | د. ولید حمدی | و. لە عەرەبیەوە/ موحەممەد نوری تۆفیق |
| ١١-زمانی ئاگایی، ئاگایی زمان/ رەخنە | عبدالمطلب عبدالله | |
| ١٢-بەهەشتی ئەوبەر پردەکە/ نۆڤلێت | رێبوار حەمە رەحیم | |
| ١٣-مستەفا سایب ئەستێرەگەشەی | | |
| کورد/ کەلەپوور و مێژووی کورد | کەمال رەئووف محەممەد | |
| ١٤-رووەك و پزیشکێتی میللی | | |
| کوردی/ فەرهەنگی گیاناسی | کەمال جەلال غەریب | |
| ١٥-زستانە خەون/ رۆمان | گوڵی تەرەقی | و. لەفارسییەوە/ دلاوەر قەرەداغی |
| ١٦-هاورێنامە بۆ مێژووی | | |
| کوردستان/ مێژوویی | هاورێ باخەوان | |
| ١٧-پیدرۆ پارامۆ/ رۆمان | خوان رۆلفۆ | و. لەفارسیەوە: ئازاد بەرزنجی و |
| | | رێبوار سیوەیلی |
| ١٨- ئاغا و شێخ و دەوڵەت/مێژوو | مارتین فان برونەسن | و. لەئەڵمانییەوە: کوردۆ |
| ١٩-پاڵمە خۆی/ وتار | | و. لەسویدەوە: رێبوار رەشید |
| ٢٠-چراکانی سەر هەڵەموت/ پەخشان | شێرکۆ بێکەس | |
| ٢١- گۆران و | | |
| گەران بەدوای یەقیندا/ لێکۆڵینەوە | عەتا قەرەداغی | |
| ٢٢- کتێبی (ژن)/ لێکۆڵینەوەو وتار | کەژاڵ ئەحمەد | |

